و: حسین محمود هەڵەبجەیی



# لێکدانەوەی خەونەکان



## لە تیڕوانینی ئاین و زانستەوە

2007

چاپی دووەم





# لێکدانەوەی خەونەکان


دانانی: ئەحمەد الصباحي عوض الله

وەرگێڕانی: حسین مەحموود هەڵەبجەیی







چاپی یەکەم

١٤٢٣ ك - ٢٠٠٢ ز




**ناوی کتێب:** لێکدانەوەی خەونەکان.

**دانان و لێکۆڵینەوەی:** أحمد الصباحي عوض الله.

بەڕێوەبەری نووسینگەی زانستی بۆ لێکدانەوەی خەونەکان لە قاهیرە.

**وەرگێڕانی:** حسین محمود هەڵەبجەیی.

**تیراژ:** (٥٠٠) دانە.

**کۆمپیوتەر:** مەڵبەندی کۆمپیوتەری پێشڕەو - هەڵەبجەی شەهید

**چاپ:** یەکەم.

**ساڵ:** ٢٠٠٢ ز ١٤٢٣ ك

# پێڕست

# ئەدەبی خەوتن و دوعا کردن

{عَـنْ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ قَالَ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَتَيْتَ مَضْجَعَكَ فَتَوَضَّأْ وُضُوءَكَ لِلصَّلَاةِ ثُـمَّ اضْـطَجِعْ عَلَـى شِقِّكَ الْأَيْمَنِ ثُمَّ قُلْ اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ وَجْهِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَغْبَةً وَرَهْبَةً إِلَيْكَ لَا مَلْجَأَ وَلَا مَنْجَا مِنْكَ إِلَّا إِلَيْكَ اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ فَإِنْ مُتَّ مِنْ لَيْلَتِكَ فَأَنْتَ عَلَى الْفِطْرَةِ وَاجْعَلْهُنَّ آخِرَ مَا تَـتَكَلَّمُ بِـهِ قَالَ فَرَدَّدْتُهَا عَلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَلَمَّا بَلَغْتُ اللَّهُمَّ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ قُلْتُ وَرَسُولِكَ قَالَ لَا وَنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ} رواه البخاري.

**واتــە:** لــە بــەرائی کــوڕی عازبــەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوەﷺ فەرمووی: ئەگەر چوویتە پــێخەفەکەت دەسـت نوێــژی نوێــژ بشۆرەو پاشان لەسەر لای راست رابکشێ و بڵێ: ئەی خوایە ئەوا نەفسم تەسلیمی تۆ کردو کاروبارم دایە دەست تۆو رووم کردە تۆو پشتم بەست بــە تــۆ، بە ئومێدو بە ترسان لە تۆ، هیچ داڵدەو شوێنی رزگاربوونێك نی‌یە جگە بۆ لای تــۆ، بــاوەڕم هێــنا بــە کتێــبەکەت کــە داتــبەزاندووەتە خــوارەوە، وە بە پێغەمبەرەی کە ناردووتە.

{عَنْ حُذَيْفَةَ ﷺ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا أَخَذَ مَضْجَعَهُ مِنْ اللَّيْلِ وَضَعَ يَدَهُ تَحْتَ خَدِّهِ ثُمَّ يَقُـولُ اللَّهُـمَّ بِاسْمِكَ أَمُوتُ وَأَحْيَا وَإِذَا اسْتَيْقَظَ قَالَ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ} رواه البخاري.

**واتــە:** لــە حوزەیفەوە ﷺ وتی: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بچوایەتە پێخەفەکەیەوە دەستی دەخســتە ژێــر روومــەتی و پاشان دەیفەرموو: ئەی خوایە بە ناوی تۆوە دەمرم و دەژیم، وە ئەگــەر هەســتایە لــە خــەو دەیفــەرموو: سوپاس بۆ ئەو خوایەی زیندووی کردینەوە دوای ئەوەی کە مراندینی وە بۆ لای ئەوە دەگەڕێینەوە.

{عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ إِذَا أَوَى إِلَى فِرَاشِهِ كُلَّ لَيْلَةٍ جَمَعَ كَفَّيْهِ ثُمَّ نَفَثَ فِيهِمَا فَقَرَأَ فِيهِمَا قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ وَ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ وَ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ثُمَّ يَمْسَحُ بِهِمَا مَا اسْتَطَاعَ مِنْ جَسَدِهِ يَبْدَأُ بِهِمَا عَلَى رَأْسِهِ وَوَجْهِهِ وَمَا أَقْبَلَ مِنْ جَسَدِهِ يَفْعَلُ ذَلِكَ ثَلَاثَ مَرَّاتٍ} رواه البخاري.

**واتــه:** عائیشــه -خــوا لــێی رازی بێــت- دەڵێ: ئەگەر پێغەمبەرﷺ بچوایەتە ناو پــێخەفەکەی هــەموو شــەوێ دەســتی کــۆ دەکردەوەو پاشان فوی دەکرد پیایداو ئەمانەی دەخوێــند: ﴿قــل هو الله أحد﴾ ، ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾، ﴿قل أعوذ برب الناس﴾، پاشان چــەندەی بتوانــیایە دەســتی ئەهێــنا بــە لاشــەیدا، لەسەر رووخساری پێشەوەی لەشیەوە دەستی پێ ئەکرد، ئەم کردارەی سێ جار ئەنجام ئەدا.

{عَــنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﵁ قَالَ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَأْمُرُنَا إِذَا أَخَذَ أَحَدُنَا مَضْجَعَهُ أَنْ يَقُولَ اللَّهُــمَّ رَبَّ السَّمَوَاتِ وَرَبَّ الْأَرَضِينَ وَرَبَّنَا وَرَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَفَالِقَ الْحَبِّ وَالنَّوَى وَمُنْزِلَ الــتَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِــيلِ وَالْقُرْآنِ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ كُلِّ ذِي شَرٍّ أَنْتَ آخِذٌ بِنَاصِيَتِهِ أَنْتَ الْأَوَّلُ فَلَــيْسَ قَــبْلَكَ شَيْءٌ وَأَنْتَ الْآخِرُ فَلَيْسَ بَعْدَكَ شَيْءٌ وَالظَّاهِرُ فَلَيْسَ فَوْقَكَ شَيْءٌ وَالْبَاطِنُ فَلَيْسَ دُونَكَ شَيْءٌ اقْضِ عَنِّي الدَّيْنَ وَأَغْنِنِي مِنْ الْفَقْرِ} رواه الترمذي.

**واتــه:** ئــەبو هورەیــرە﵁ دەڵــێ پێغەمبەرﷺ فەرمانی پێ دەداین ئەگەر کەسێکمان رۆشــتە نــاو پــێخەفەکەی بــا بڵێــت: ئــەی خوایــە ئــەی پــەروەردگاری حــەوت ئاسمان و پەروەردگاری عەرشی گەورە، پەروەردگارمان پەروەردگاری هەموو شتێك، تەقێنەری تۆوی دانەوێڵــەوو نــاوك، دابەزێنەری تەورات و ئینجیل و قورئان، پەنا دەگرم بە تۆ لە خراپەی هــەموو شــتێك کــە ناوچەوان و نسیبــی بە دەست تۆیە، ئەی خوایە تۆ یەکەمینیت و لە پــێش تــۆوە هــیچ شتێك نییە، وە تۆ دواهەمینی و لە پاش تۆوە هیچ شتێك نییە، وە تۆ زاڵی بەسەر هەموو شتێکدا، هیچ شتێك لەسەروو تۆوە نییە، تۆ پەنهانی بەسەر هەموو شتێکداو دوای تۆ هیچ شتێك نییە، قەرزاریمان لابەرەو دەوڵەمەندمان بکە.

# بەشەکانی خەو

{عَـــنْ عُـــبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ رُؤْيَا الْمُؤْمِنِ جُزْءٌ مِنْ سِتَّةٍ وَأَرْبَعِينَ جُزْءًا مِنْ النُّبُوَّةِ} رواه البخاري.

**واتــە:** لــە عوبــادەی کــوڕی صــامتەوە ﷺ پێغەمــبەر ﷺ دەفەرموێ: خەوی ئیماندار بەشێکە لە چل و شەش بەش لە پێغەمبەرایەتی.

{حَدَّثَـــنَا أَنَـــسُ بْنُ مَالِكٍ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِنَّ الرِّسَالَةَ وَالنُّبُوَّةَ قَدْ انْقَطَعَتْ فَلَا رَسُولَ بَعْدِي وَلَا نَبِيَّ قَالَ فَشَقَّ ذَلِكَ عَلَى النَّاسِ فَقَالَ لَكِنْ الْمُبَشِّرَاتُ قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَمَا الْمُبَشِّرَاتُ قَالَ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ وَهِيَ جُزْءٌ مِنْ أَجْزَاءِ النُّبُوَّةِ} رواه الترمذي.

**واتــە:** بێگومان پەیام و پێغەمبەرایەتی پچڕاو نەما، دوای من فروستادەو پێغەمبەر نییــە، وتــیان: ئەمــە لەسەر خەڵکی ناڕەحەتە، فەرمووی: بەڵام مژدە هێنەرەکان هەیە، وتیان ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ مژدە هێنەرەکان چییە؟ فەرمووی: خەو بینینی موسڵمان، کە بەشێکە لە بەشەکانی پێغەمبەرایەتی.

{عَـــنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ إِذَا رَأَى أَحَدُكُمْ رُؤْيَا يُحِبُّهَا فَإِنَّمَا هِـــيَ مِنْ اللَّهِ فَلْيَحْمَدْ اللَّهَ عَلَيْهَا وَلْيُحَدِّثْ بِهَا وَإِذَا رَأَى غَيْرَ ذَلِكَ مِمَّا يَكْرَهُ فَإِنَّمَا هِيَ مِنْ الشَّيْطَانِ فَلْيَسْتَعِذْ مِنْ شَرِّهَا وَلَا يَذْكُرْهَا لِأَحَدٍ فَإِنَّهَا لَا تَضُرُّهُ} رواه البخاري.

**واتە:** لە ئەبی سەعیدەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوە ﷺ فەرموی: ئەگەر یەکێکتان خەوێکی بــینی و خەوەکــەی پــێ خۆش بوو، ئەوە لە لایەن خواوەیە با سوپاسی خوا بکات و باسی بکات و بیگێڕێتەوە، ئەگەر پێچەوانەی ئەوەی بینی کە ناخۆش بوو، ئەوە لە شەیتانەوەیە بــا پــەنا بە خوا بگرێت لە شەڕی شەیتان و با باسی نەکات بۆ کەسی تر ئیتر زیانی بۆی نابێت.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ إِذَا اقْتَرَبَ الزَّمَانُ لَمْ تَكَدْ رُؤْيَا الْمُسْلِمِ تَكْذِبُ ...}

**واتە:** گەر ڕۆژی دوایی نزیك بوویەوە خەونی موسڵمان بە درۆ دەرناچێت.

# گێڕانەوەی خەوی ڕاست

{عَــنْ سَمُرَةَ بْنِ جُنْدَبٍ قَالَ كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا صَلَّى الصُّبْحَ أَقْبَلَ عَلَيْهِمْ بِوَجْهِهِ فَقَالَ هَلْ رَأَى أَحَدٌ مِنْكُمْ الْبَارِحَةَ رُؤْيَا} رواه مسلم.

**واتــه:** لــه ســەمورەی كــوڕی جوندوبەوە ﷺ وتی: پێغەمبەرﷺ ئەگەر نوێژی بەیانی بكــردایە ڕووی موبارەكی دەكردە هاوەڵان و دەیفەرموو: ئایا شەوی ڕابردوو كەستان خەوی بینی؟.

{عَــنْ جَابِرٍ قَالَ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ رَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ رَأْسِي ضُرِبَ فَتَدَحْرَجَ فَاشْتَدَدْتُ عَلَى أَثَرِهِ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ لِلْأَعْرَابِيِّ لَا تُحَدِّثْ النَّاسَ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِكَ فِي مَنَامِكَ وَقَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعْدُ يَخْطُبُ فَقَالَ لَا يُحَدِّثَنَّ أَحَدُكُمْ بِتَلَعُّبِ الشَّيْطَانِ بِهِ فِي مَنَامِهِ} رواه مسلم.

**واتــه:** لــه جابــردوه ﷺ وتــی: ئەعــرابی‌یەك هاتــه خــزمەت پێغەمبەرﷺ وتی: ئەی پێغەمــبەری خــوا له خەومدا بینیم وەك لەسەرم درابێت خل بوویەوەو منیش له ئەنجامی ئــەوەدا ناڕەحــەت بــووم، پێغەمــبەری خواﷺ فەرمووی: باسی مەكە بۆ خەڵكی بە یاری كردنی شەیتان پێت لە خەودا.

# گێڕانەوەی خەو بە درۆوە

{عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ عَنْ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ مَنْ تَحَلَّمَ بِحُلْمٍ لَمْ يَرَهُ كُلِّفَ أَنْ يَعْقِدَ بَيْنَ شَعِيرَتَيْنِ وَلَــنْ يَفْعَــلَ وَمَنْ اسْتَمَعَ إِلَى حَدِيثِ قَوْمٍ وَهُمْ لَهُ كَارِهُونَ أَوْ يَفِرُّونَ مِنْهُ صُبَّ فِي أُذُنِهِ الْــآنُكُ يَــوْمَ الْقِــيَــــــــــامَةِ وَمَنْ صَوَّرَ صُورَةً عُذِّبَ وَكُلِّفَ أَنْ يَنْفُخَ فِيهَا وَلَيْسَ بِنَافِخٍ} رواه البخاري.

**واتــه:** لــه ئیبن عەبباسەوەﷺ له پێغەمبەرەوەﷺ فەرمووی: ئەوی خەوێك بگێڕێتەوە بەڵام نەیبینیبێت ئەوە لە ڕۆژی دواییدا داوای لــێ دەكرێت كە دوو دەنكە جۆ گرێ بدات، وە ناتوانێت...

# بینینی پێغەمبەرﷺ لە خەودا

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَآنِي فَإِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَمَثَّلُ بِي} رواه مسلم.

**واتە:** لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوەﷺ فەرمووی: ئەوەی لە خەودا منی بینی ئەوە منی بینیوە، شەیتان ناتوانێ لە شێوەی مندا خۆی نیشان بدات.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَسَيَرَانِي فِي الْيَقَظَةِ وَلَا يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ بِي} رواه البخاري.

**واتە:** لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ لە پێغەمبەرەوەﷺ فەرمووی: ئەوەی لە خەودا منی بینی، ئەوە لە ڕۆژی دواییشدا من دەبینێت، شەیتان ناتوانێ لە شێوەی مندا خۆی نیشان بدات.

{عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَنْ رَآنِي فِي الْمَنَامِ فَقَدْ رَأَى الْحَقَّ إِنَّ الشَّيْطَانَ لَا يَتَشَبَّهُ بِي} رواه أحمد.

**واتە:** لە ئەبو هورەیرەوە ﷺ پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ئەوەی لە خەودا منی بینی ئەوە هەق و ڕاستیی بینیوە، شەیتان ناتوانێ بێتە شێوەی منەوە.



**١-ئايەتـەكانى قورئـان:** خوێـندنى ئايەتـەكانى قورئـانى پـيرۆز لە خەودا ئەگەر ئايەتـەكان مـژدە دان بوون ئەوە مژدەى پێ ئەدا بە چاكە، وە ئەگەر ئايەتەكان ئاگادارى بـوو ئـەوە ئاگـادارى ئـەكات لـە كـردنى خـراپەيەك، ئەگـەر خوێـنەرەكە مردوو بوو وە ئايەتـەكان رەحمـەت بـوون، ئەوە لە رەحمەتى خواى گەورەدايە، وە ئەگەر ئايەتەكان سزا بوون ئەوە لە سزاى خواى گەورەدايە.

**٢-ئافـرەتى گەنج:** ئافرەتى گەنج و جوان لە خەودا بەڵگەيە لەسەر دنيا لە شێوازى نـاوى و جوانـى و جەسـتەيدا، چـونك ئـەو ئافـرەتە دنـيايە، وە زۆرجار بەڵگەيە لەسەر سـوڵتان، چونكە ئافرەت دادگەرە بەسەر پياوەوە، ئەگەر جوان و قەڵەو بوو ئەوە ئەو ساڵە پڕ لە رۆزىيەو ئەگەر روخسار ناشيرين بوو ئەوە ساڵەكەى قڕانە.

**٣-ئافـرەتى پـير:** پيرەژنـى نەناسراو ئەگەر ناشيرين بوو يان عەيب دار بوو بەڵگەيە لەسەر دنياى رابردوو بەسەر چوو، وە ئەگەر جوان و پاك و خاوێن و گەشاوە بوو، بەڵگەيە لەسەر دوا رۆژێكى باش، پيرەژنى ناسراويش بە دەروون و خودى خۆيەتى.

**٤-ئـازار:** هەسـت كردن بە ئازار لە خەودا بەڵگەيە لەسەر ئاسوودەيىيەكى گەورەى چـاوەڕوان كراو، وە ئەگەر پياوێكى ئازارويت بينى بەڵگەيە لەسەر ئەوەى كە كردەوەكانت هۆيەكن بۆ ئازاردانى هەندێ كەس.

٥-**ئێرەیی**: ئیرەیی لە خەودا نیشانەیە لەسەر رێکخستنی پیلان دژ بە تۆ لە کاتێکدا ئیرەیی بە تۆ ببرێت، بەڵام ئەگەر خۆت ئیرەیی بە خەڵك ببەیت ئەوە ناخۆشیت دووچار نەبێت.

٦-**ئاسن**: بینینی ئاسن لە خەودا نیشانەیە لەسەر هێزو بێزاری و سامان و بڵندی.

٧-**ئاسنگەر**: خەو بە ئاسنگەرەوە مانای وایە ماڵێکی زۆری چاوەڕوان نەکراوت دەستگیر ئەبێ.

٨-**ئەسپ**: خەو بە ئەسپەوە زۆر باشە، سوار بوونی ئەسپ یان بینینی نیشانەیە بۆ ئەوەی کەسێك تۆی زۆر خۆش دەوێت، سامان و ماڵێکی چاوەڕوان نەکراوت بۆ دێت، ئەگەر کەسێك بە سواری ئەسپ بەرەو رووت ئەهات ئەوە ئاگاداری‌یە بۆت کە لەم نزیکانە گەشتێکی چاوەڕوان نەکراو ئەکەیت، ئەگەر ئەسپ و سوارەکە لە لای تۆوە رۆیشتن ئەوە گەشتەکە دوای کاتێت تەواو نەبێت، بینینی ئەسپی مردوو ئاگاداری‌یە بۆ ناخۆشی لە ئیشەکەتدا، ئەگەر لە خەودا پێشبڕکێت ئەکرد بە سواری ئەسپەوە نیشانەیە لەسەر بەختیاری‌یەکی گەورە بە تایبەتی ئەگەر سەرکەوتی لە پێشبڕکێ‌یەکەدا، ئەگەر لە خەودا سەیری پێشبڕکێی ئەسپت ئەکرد مانای وایە هەواڵێك ئەبیستی.

٩-**ئاهەنگ**: خەو بە گێڕانی ئاهەنگەوە نیشانەی زیانە بۆ خەو بینەکە، ئامادە بوون لە ئاهەنگیشدا نیشانەیە لەسەر داواکردنی یارمەتی لە هاوڕێکەت، بەڵام ئاهەنگی هاوسەرایەتی ئەوە نیشانەیە بۆ هاوسەرایەتی یان یارمەتی.

١٠-**ئاوریشم**: خەو بە ئاوریشم لەبەرکردنەوە یان بیفرۆشی یان بیکڕی خەوێکی چاکە، ئەگەر هاوسەرت نەبێ ئەوە بەم نزیکانە کەسێك ئەبینی کە خۆشت بوێ، ئەگەر هاوسەرێشت هەبێ ئەوە هەواڵی چاوەڕوان نەکراو ئەبیستی، ئەگەر خەوت بینی پۆشاکێکی ئاوریشم ئەدووریتەوە ئەوە کارەکانت سەرکەوتوو ئەبن، هەرچەندە بەربەستیان هەبێت.

۱۱-**ئـارد:** ئـاردی گـەنم لـە خـەو رۆزی‌یەو ئاردی برنج بەخششە، ئاردی بێجگە لە گەنمیش چاك بوونەوەیە لە نەخۆشی.. وەاردنی ئارد لە خەودا هەژاری‌یە، وە هەویری گەنم گەشتەو هەویری ئاردی جۆ جێگیریی و سەرکەوتنە.

۱۲-**ئاڵتوون:** لە خەودا بۆ ئافرەت پیرۆزی و رازانەوەو جوانی دنیایەو نیشانەیە لەسەر منداڵەکانیان، ئاڵتوون نێرینەیەو، بینینی دراوی ئاڵتوون نیشانەیە لەسەر بینینی روخساری فەرمانڕەوا.. بوونی ئاڵتون لە خەودا مانای گرتنە دەستی دەسەڵاتە، وە ئاڵتوون وەرگرتن لە کەسێکەوە مانای دڵپاکی ئەو کەسەیە بۆ تۆو هەروەها سەرکەوتنی پرۆژەکانیشتە، ئەگەر ئاڵتوونت ئەدا بە کەسێ مانای وایە سەرئەکەویت بەسەر ناڕەحەتیدا، ئەگەر لە خەودا ئاڵتوونت گوم کردو ئەگەڕایت بە دوایدا مانای وایە کەسێکت ون کردووە کە جێی متمانەی تۆیە. خەو بینین بە ئەنگوستیلەی ئاڵتوونەوە نیشانەی هاوسەرێتی‌یە بۆ عازەب، وە نیشانەی منداڵە بۆ هاوسەردار، یان سەرکەوتنە لە کاردا ئەگەر ئەنگوستیلەکە لە دەستی خۆتا بێت یان دەستی کەسێکی تر.

۱۳-**ئاڵتوونی زۆر:** نیشانەیە لەسەر بە دەست هێنانی سامان.

۱٤-**ئاڵتوونی کەم:** نیشانەیە لەسەر ون کردنی سامان.

۱٥-**ئاڵتوونی پۆشراو:** ئاڵتوونی رووکەش نیشانەیە لەسەر گەلێکی ناڕێك.

۱٦-**ئاڵتوونی دۆزراوە:** نیشانەیە بۆ سەرکەوتنێکی کەم خایەن.

۱۷-**ئالا:** ئالای سوور لە خەودا خۆشی و ئاسوودەیی‌یە، ئالای رەش پیاوەتی و شەرەفە، ئالای سەوز ئایین و چاکسازی‌یە، ئالای سپی زانست و خواپەرستی‌یە.، بینینی کۆمەڵە ئالا لـە خەودا نیشانەی بارانە، ئەگەر ئالاکان رەش بوون ئەوە زانستەو ئەگەر سپی بوون ئەوە ئاشتی‌یەو ئەگـەر سـوور بـوون ئەوە جەنگەو ئەگەر زەرد بوون ئەوە پەتایەو ئەگەر سەوز بوون ئەوە گەشتە.

۱۸-**ئـارەزووی بـەرز بوونەوە:** مانای ئارەزووە لە سەرکەوتنی مەبەست و گەیشتن بە ئاوات.

۱۹ **ئاسمان:** ئاسمان لە خەودا نیشانەیە لەسەر گەڕان و بەختیاری و خۆشی بۆ ئەسیك رووی تێ بکات یان سەیری بکات یان لە سێبەریدا بێت، هەندێ جاریش نیشانەیە لەسەر فەرمانڕەوا، ئەوەی لێی ببینرێ یان تیایدا یان لێی بێتە خوارەوە لە چاکەو خراپە، ئەوە نیشانەیە لەسەر فەرمانڕەوا، وە ئەڵێن نیشانەیە لەسەر خۆی، ئەوەی لێی بێتە خوارەوە نموونەکەی لای خوای گەورەش دێتە خوارەوە، ئەگەر ئاسمان سایەقەو خۆر بوو ئەوە نیشانەیە بۆ داهاتوویەکی بەختیار، ئەگەر تاریك و هەور بوو ئەوە نیشانەی دۆڕانە.

۲۰-**ئۆتۆمبێل:** سواربوونی ئۆتۆمبێل مانای گۆڕانە لە ماڵدا یان لە کارداو گۆڕانی گوزەرانە بۆ باشتر، ئەگەر ئۆتۆمبێلەکە شکا، ئەوە ئاگاداری‌یە لە دۆڕان، بینینی ئۆتۆمبێلی شکاو نیشانەی ئەوەیە هەواڵێك لە هاورێیەکتەوە دەبیستی کە ئەنجامەکەی ناخۆشی‌یە.

۲۱-**ئاودەر:** ئاو دەری لە خەودا نیشانەیە بۆ ژیانێکی خۆش.

۲۲-**ئیفلیجی:** ئەگەر لە خەودا خۆت بە ئیفلیجی بینی مانای وایە دوژمنێکت دەیەوێ جوڵانەوەت ئیفلیج بکات و زیان و شەڕت تووش بکات.

۲۳-**ئاش – ئاوگێڕ:** ئاشی بێ زبانی بازنەیی لە خەودا سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆ بازرگان و پیشەسازو کرێکارو سەرمایەداران، وە بەختێکی ئاسوودەیە لە هاوسەرایەتی و خۆشەویستان و ئارەزوومەندانی هاوسەرێتی، ئەگەر ئاشەکە شکابوو یان لە کار کەوتبوو یان خڕ نەبوو ئەوە بەختەکە کەمترە لەوەی ئاشەکە لە گەڕدا بێت.

۲٤-**ئێسك:** نهێنی‌یەکت هەیە بڵاو نەبێتەوە.

۲٥-**ئەنگوستیلە:** پۆشینی ئەنگوستیلە لە خەودا بۆ کچ نیشانەیە بۆ جوانی و رازاوەیی و هیواو شوکردنی بەختیارانە، وە بۆ هاوسەران نیشانەی بەختیارانەیە یان منداڵی نوێ یان ئەگەر ئەنگوستیلەکە جوان بوو دڵخۆش بوو پێی ئەوە بەختیارە بە مێردەکەی یان منداڵەکەی.. وە ئەنگوستیلەی مرواری یان شیلانە نیشانەی لەسەر ترس بە ئەندازەی بچووکی و جوانی و زۆری مرواری‌یەکە.

**٢٦-ئـالا:** (عَلَم): ئەگـەر لـە خەودا ئالایەکی بەرزت لە هەوایەکی گەشاوەدا بینی ئـەوە بەڵـێنی سـەرکەوتن و زاڵ بوونـە بەسەر دوژمنەکانتا، بەڵام ئەگەر دڕاو بوو یان لە قوڕێکـدا دانـرابوو، ئـەوە ناڕەحەتیەکەت زۆر قورس و گرانە، ئەگەر ئالاکە لە ناوەڕاستی بازنەیەکدا بوو، ئەوە بە زۆری هەواڵی مردنی کەسێکی گرنگ ئەبیستیت، وە ئالای سوور لـە خـەودا نیشـانەیە لەسـەر جەنگ، ئالای زەرد نیشانەیە لەسەر پەتا، سەوزیش لەسەر سەفەر کردن بۆ کاری خێر، سپیش نیشانەی ئاشتییەو رەشیش نیشانەی قاتی و ترسە، وە سەرسـامێ ئەگەر لە خەودا ئالای بینی ئەوە رێنمومایی ئەکرێ ئەگەر ئافرەت بینی ئەوە شوو ئەکات.

**٢٧-ئـاسـك:** بینـینی ئاسـك لـە خـەودا نیشانەیە لەسەر خۆش بەختی، بەڵام ئەگەر بینیـت رای ئەکرد نیشانەی تێکچوونە لەگەڵ خۆشەویستەکەتدا، وە بینینی بە مردوویی نیشانەی ئەوەیە هاوڕێیەکت دەست پاك نییە، ئاسکەکەش بکوژیت هەر وایە.

**٢٨-ئوتـێل:** بینـینی ئۆتـێل لـە خـەودا نیشـانەی ژیانێکی هێمن و رەزامەندییە، نیشـتەجێ بوونـیش لـە ئوتێلدا نیشانەیە لەسەر ژیانێکی راگوێز لە نێوان سەرکەوتن و دۆڕان و دەوڵەمەندی و هەژاری.

**٢٩-ئەشکەوت:** ئەشکەوت لە خەودا مانای بوونی منداڵە یان حەز لـێ کردنی.

**٣٠- ئـاو:** ئـاو لە تەفسیردا ژیانێکی خۆشە ﴿وجعلنا من الماء كل شئ حي﴾ لە ئـاو هـەموو شـتێکی زیـندوومان دروسـت کردووە. بینینی ئاو لە خەودا لەش ساغی و ئاسـوودەیی و زۆر بوونـی چـاکەیە، ئەگەر ئاوەکە بە خوڕ بوو نیشانەی هەرزانی و نرخ و حوکمـێکی دادپەروەرانەیـە، خواردنەوەی ئاو لە خەودا ئاسایشە لە دوژمن و سوننەتێکی چاکە بۆ ئاو خۆرەکە، زۆر خواردنی ئاو لە خەو-دا نیشانەیە لەسەر بەخت باشی و تەمەن درێژیی، وە رۆیشتن بەسەر ئاودا نیشانەی سەرکەوتنە لە کاروباردا، ئەوەی خەوی بینی لە قاپـێکدا ئـاوی روون دەخواتـەوە ئـەوە چاکەی لە کوڕو ژنەکەیەوە دەستگیر ئەبێ، ئەوەی بینی ئاو لە قاپێکدا ئەدا بە کەسێکی تر ئەوە نیشانەی منداڵە، بەڵام ئەگەر ئاوەکە پیس بـوو، وە لە شێوەی شەپۆلدا بوو، ئەوە نیشانەی ناڕەحەتییە، پێویستی بە تێکۆشان هەیە

، ڕال سوون بەسەریدا بە تایبەتی ئەگەر تۆ تینوت بێت و تینوویەکەت بەسەر بڕوا ببینەوە، وە ئاوی گەرم غەم و ناڕەحەتی‌یە لە دەسەلاتدارانەوە.

٣١-**ئاوێنە:** سەیرکردنی ئاوێنە لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاوەتی و دڵ و ڕەوشت و ئایین و تەندروستی و پلەی کۆمەلایەتی خەو بینەکە، ئەگەر روخساری خۆی بە ناشیرینی ببینی ئەوە شتێك لەوانەی تێدا باشە یان هەمووی بە ڕادەی جوانی روخساری، ئەوگەر روخساری دەم و چاوی بە ناشیرینی بینی نیشانەیە لەسەر خراپی گوزەرانی بە ڕادەی ناشیرینی رووخساری، وە سەیرکردنی ئاوێنە بۆ عازەب جووت بوونە، ئەگەر روخساری خۆی بە گەشاوەیی بینی، وە بۆ پیاوێك کە ژنەکەی سکی هەبێت ئەوە نیشانەی بوونی کوڕە کە لە خۆی ئەکات، وە بۆ سەفەر کەر نیشانەی سەفەرەکەیەتی، وە ناشیرینی روخساری نیشانەیە لەسەر بێ سوودی و ناڕەحەتی لە گەشت و سەفەرەکەیدا، وە ئەڵێن ئەوەی لە خەودا سەیری ئاوێنەی کردو روخساری خۆی بینی وەك خۆی وابوو ئەوە کوڕێکی دەبێت لە شێوەو کاردا لە خۆی دەکات، وە ئەگەر رووخساری بە ڕەشی بینی نیشانەیە لەسەر پیاوەتی و شەرەفی لەناو خەڵکدا، ئەڵێن سەیر کردنی ئاوێنەیە نیشانەیە لەسەر مردنی کەسێ لەو خێزانەدا، وە ئەڵێن ئاوێنە لە خەودا هاوڕێ‌یەکی ناپاکەو ئاوێنەی شکاویش نیشانەی هەواڵی خراپە.

٣٢-**ئافرەت:** ئافرەتی روخسار جوان لە خەودا نیشانەیە لەسەر ساڵی داهاتوو بە چاکە، ئەگەر ئەو ئافرەتە لە ماڵدا هاتە لات ئەوە شادی و خێر بە دەست ئەهێنی، ئەوەی ئافرەتێ بە روو گەشاوەیی ببینێ بەرامبەری، ئەوە چەند کارێکی بۆ پێشنیار ئەکرێ کە دروست کراوە، ئافرەتی قەڵەو ساڵێکی بە پیتەو ئافرەتی لاواز ساڵێکی گرانییە، وە باشترین ئافرەت لە تەفسیردا لە نەزانراوەکانن، ئەگەر ئافرەتێ لە خەویدا ئافرەتێکی گەنج ببینێ ئەوە دوژمنیەتی بە هەر شێوەیەك بێت، وە ئەگەر ئافرەتێکی پیری بینی نیشانەیە لەسەر بەسەرچوونی بەخت و ئاسوودەیی‌یەکەی، ئەوەی ئافرەتێکی باش ببینێ و قسەی لەگەڵ بکاو پێ بکەنێ بە دەمیەوە یان بچێتە لای ئەوە نیشانەی ساڵێکی بە پیتە، ئەگەر

هەژار بوو خوا دەوڵەمەندی ئەکات، ئەگەر ئافرەتێکی دامەزراوو ڕەزامەندی بینی، ئەوە چاکەیەکی ڕەزامەندە.

٣٣-**ئەندازیار:** ئەندازیار لە تەفسیردا ڕەمزە بۆ گۆڕانکاری ئیش لە باشەوە بۆ باشتر.

٣٤-**ئەڵماس:** خەو بە ئەڵماسەوە ڕەمزە بۆ بەختیاری و ئاسوودەیی، وە ئەگەر لە خەودا ئەتفرۆشت یان ئەتکڕی ئەوە نیشانەیەکی ترسناکە.

٣٥-**ئاوی ودستاو:** خەو بە ئاوی وەستاوەوە مانای وایە تۆ لە حاڵەتی نەماندایت یان دڵە ڕاوکێ یان نەمان بە نیسبەت کێشەیەکتەوە.

٣٦-**ئاگر:** ئاگر لە تەفسیردا لەسەر چەند شێوازێکە:

❁ ئاگر لە خەودا خێرو مژدەو دەوڵەمەندی و پلەو پایەیە بۆ کەسێ بیبینێ کە لە ماڵەکەیدا رووناك ئەبێتەوە.

❁ ئەگەر لە ماڵێکی تردا بینی ئەوە لە دەست دانی هاوڕێیەکیەتی.

❁ ئەوەی ئاگرێکی شەوقدار ببینێ و بەرەو رووی بڕوا لە ترسناکیدا ئامێنێتەوە.

❁ ئەوەی ئاگرێکی تیشکدار ببینێ و کۆمەڵێ بە چوار دەوریدا بن، ئەوە ئەو کۆمەڵە تووشی چاکەو بەرەکەت ئەبن.

❁ ئەگەر بە ڕۆژ ئاگرت بینی ئەوە نیشانەی جەنگ و فیتنەیە، ئەگەر زمان و بڵێسەو دەنگی هەبێ، ئەگەر هیچ شتێکی لەوانە نەبوو نیشانەیە لەسەر نەخۆشی.

❁ ئەوەی لە خەودا ئاگرێکی تووش بێ و بیسووتێنێ تووشی نارەحەتی دێت لە دەسەڵاتدارانەوە، وە ئەگەر نەیسووتێنێ ئەوە سامانێکی زۆری دەستگیر ئەبێ.

❁ ئەوەی بڵێسەی ئاگر لە دەرگای ماڵەکەیدا ببینێ بە بێ دووکەڵ ئەوە نیشانەی حەجە، وە ئەگەر بڵێسەکە لەناو ماڵەکەدا بوو ئەوە نیشانەی جووت بوونە.

❁ وە خەو بە ئاگری بڵێسەدارەوە ڕەمزە بۆ نەهامەتی و دووبەرەکی.

٣٧-**ئەستێرە:** بینینی ئەستێرە لە ئاسماندا چاکەو ئاسوودەیی و لەش ساغیە بە تایبەتی ئەگەر بە ئاشکرایی دیار بێ و گەشاوە بێ، وە لە تەفسیردا ڕەمزە بۆ زانایان و پیاو ماقوڵانی هۆز.

٣٨-**ئێش**: ئێش لە خەودا نیشانەی پەشیمانی‌یە لە گوناھـ.

٣٩-**ئاهەنگ**: ئاهـەنگ لە خەودا نارەحەتی‌یە لە ژیانتدا، بەڵام ئەو خۆشەویستانەی خـەو بـە ئاهەنگەوە ئەبینن لە ماڵاتێکی دیاری کراودا، ئەوە لەو ماڵەدا ژن دەهێنن یان شوو دەکەن.

٤٠-**ئەڵقەرێـز**: ئەڵقەرێزی دەرگا لە خەودا رەمزە بۆ ئەو ئافرەتەی نهێنی‌یەکانی پیاو ئەپارێزێ.

٤١-**ئاوەڕۆ**: ئاوەڕۆی باراناو لە خەودا خێرو بەرەکەتە.

٤٢-**ئەسـپەردە کردن**: ئەوەی بینی لە خەودا مردوو ئەسپەردە ئەکات ئەوە گەشتێکی دوور ئـەکات.. ئـەوەی بـینی بـە زیـندوویی ئەسـپەردە ئەکرێ ئەوە سامانێك بە دەست ئەهێنێ.



**١-بـاوك:** خـەو بيـنين بە باوكەوە و وتويژ لەگەڵيدا بەڵگەيە لەسەر چاوەڕوان كردنی ئاسوودەيی و بەختياری، بينينی بە مردوويی بەڵگەيە لەسەر ژيانێكی ناخۆش.

**٢-بـرا:** ئەگـەر خـەوت بـە براكانـتەوە بـينی لـەش سـاغ و دڵخۆش بوون، ئەوە تۆ هەواڵـێكی خـۆش ئەبيستی، وە ئەگەر بە نەخۆشی يان بە پەستی بينيتن، ئەوە هەواڵەكە ناخۆشە.

**٣-بەڕێوەبردنی كاروبار:** خەو بە نووسين و بەڕێوەبردنی كاروبار بەڵگەيە لەسەر بڕوا بوون پێت.

**٤-بـازن- دەستەوانە:** بازن و دەستەوانە بۆ پياو باش نیيە، بەڵام بۆ ژن و كچ باشە، ئەگـەر بينـيان كچـێك يـان خادمێك بازن لە دەست ئەكات ئەوە تووشی كردارێكی باش ئـەبن، وە ئەگـەر خـەوی بـينی بە بوونی بازن ئەوە سەروەتێكی چاوەڕوان نەكراوی دەست ئەكەوێـت بـەم زوانــە يـان هـەر شتێكی تر، بەڵام ئەگەر بازنی لە خەودا ون كرد مانای دۆڕاندنـە، وە ئەگـەر جگـە لـە خۆتـت بـينی بازن ئەدۆزنەوە يان لە دەستی ئەكەن ئەوە هەواڵی خۆش ئەبيستی.

**٥-بـوون بـە وەزير:** ئەگەر يەكێك خۆی بينی بوو بوو بە وەزير يان قازی يان دادگەر يـان وتاربـێژ لە كاتێكدا شايانی ئەوە نەبێت ئەوە لە دنيادا تووشی بەڵاو شەڕو ريسوايی دەبێـت، وە ئەڵـێن ئـەوە خـەوێكی پـێ ڕاگەياندنــە بۆ خاوەنەكەی بۆ ئەوەی خۆی ئامادە بكات، بۆ هەڵسانەوە بەو شێوەی ئەيەوێ.

٦ **برنج:** خەو بە خواردنی برنجەوە یان لێنانی مانای وایە خۆشی‌یەکت پێ ئەگات لە لایەن کەسێکەوە کە خۆشت ئەوێ، بەڵام ئەگەر فرۆشتت یان کڕیت ئەوا چاوەڕوانی گۆرانێکی باشتر بکە لە بەختتدا.

٧-**بسم الله کردن:** ئەوەی لە خەودا (بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێند ئەوە خوای گەورە بەرەکەت ئەخاتە ماڵەکەیەوەو زیادی ئەکات.

٨-**بانق:** لە خەودا ئەگەر خۆتت لە بانقدا بینی و خەڵکت بینی پارە وەرئەگرن ئەوە نیشانەی ناڕەحەتی‌یە بۆت بە هۆی گوێ پێ نەدانتەوە، بەڵام ئەگەر پارەکە بە تۆ ئەدرا ئەو گەشبینی‌یەکی باشت تووش ئەبێ.

٩-**بروسکە:** بروسکەو نێرراو لە تۆوە یان بۆ تۆ لە خەودا مانای بیستنی هەواڵێکی گرنگە لە شوێنێکی دوورەوە یان کەسێکی دوور لە تۆ بیر لە تۆ ئەکاتەوە یان تۆ بیر لەو ئەکەیتەوە.

١٠-**باغ:** باغی ئاشکرا لە خەودا نیشانەی ژنە، چونکە ئاو ئەدرێ و ئاوس ئەبێ و منداڵی ئەبێ، باغی نائاشکرا نیشانەیە لەسەر بەهەشت، چونکە عەرەب ناوی ناوە بەهەشت، وە هەروەها خوای گەورەش بە هەمان شێوە ناوی هێناوە : ﴿أيود أحدكم أن تكون له جنة من نخيل وأعناب﴾، واتە: ئایا ئەتانەوێ باخێکتان هەبێت لە دارخورماو ترێ.. ئەو کەسەی لە خەودا باخەکەی ئاو ئەدات ئەوە کەس و کاری دێن بۆ لای ، ئەگەر بینی باغەکەی وشکە، ئەوە ژنەکەی کەڵکی نابێت، وە ئەوەی کەسێکی تری بینی باغی ئەمی ئاو ئەدا ئەوا ئەو کەسە ناپاکی لەگەڵ ژنەکەیدا ئەکات.

١١-**بیر:** بیر لە خەودا ماڵە یان زانستە یان جووت بوونە یان ژیانە، خواردنەوەی ئاوی بیر باشەو مەلە کردن لە بیردا رزگار بوونە لە تاوان و گوناه، ئەوەی لە خەودا بیرێکی هەڵکەندو ئاوی تێدا بوو، ئەوە ئافرەتێکی خانەدان مارە ئەکات. ئەگەر ئافرەتەکە بینی لە خەودا بیر ئەکەنێ ئەوە پیاوێکی چاکی تووش ئەبێت، ئەگەر خەوت بینی ئاو لە بیر دەرئەهێنی، ئەوە بەڵێنە بە سەرکەوتن لە ئیشێکی نوێدا، بە تایبەتی ئەگەر ئاوی بیرەکە پاک بێت، بەڵام خەو بە بیرێکی بێ ئاوەوە نیشانەیە بۆ دۆڕاندن، خەو بینین بە کەوتنە ناو

بیرەوە رزگار بوون و بەختیاری‌یە، وەك ئەوەی بەسەر یوسفداﷺ روویدا، وە ئەڵێن ئاگاداری‌یە لە نەخۆشی‌یەکی ترسناك کە هەڕەشەت لێ ئەکات.

۱۲-**بسکیت:** ئەگەر بسکیتت خوارد یان کڕیت یان هەر شتێکی بە نان دروست کراو، ئەوە نیشانەی ئاژاوەیەکی بچووکی خێزانی‌یە.

۱۳-**بێ نەوایی:** بێ نەوایی لە خەودا نیشانەیە بۆ هەژاری.

۱٤-**بڕینی قاچ:** بڕینی ئەندامێ یان چەند ئەندامێ لە لاشەی مرۆڤ بەڵگەیە لەسەر زیان کەوتن لە ماڵ یان کاڵ و پەل، وە بڕینی قاچ مانای تێکچوونی گەشتێکی چاوەڕوان کراوە.

۱۵-**باینجان:** بینینی باینجان لە کاتی خۆیدا رۆزی‌یە بە ماندوو بوونەوە، وە بێجگە لە کاتی خۆی چاك نی‌یە، وە خوازدنیشی نیشانەی مەرایی‌یە لە قسە کردندا.

۱٦-**بولبول:** بولبول یان هەر باڵندەیەکی بخوێنن، ئەگەر لە خەودا گوێت لە خوێندنیەوە بوو، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە گوێت لە هەواڵی باشەوە ئەبێت، یان کارێکی چاوەڕوان نەکراو روو ئەدات کە دڵخۆش ئەبیت پێی بێجگە لە قەلە رەش و داڵ، ئەوە دوو پیاوی خراپن کە بە هەواڵی درۆوە هاتوون.

۱۷-**بڕینی ڕێگا:** بڕینی ڕێگا لە خەودا ئاگاداری‌یە بۆت، ئەو ڕێگا راستەی تیایدا بۆت دەرئەکەوێ ئەوە پێویستە پیایدا بڕۆی.

۱۸-**بێ هێزی:** بێ هێزی لە خەودا نیشانەی سەرکەوتن و بەرزی و بڵندی‌یە.

۱۹-**بازرگانی:** ئەگەر لە خەودا خۆتت بینی‌یەوە بوویت بە بازرگان و لە دوکاندا دانیشتوویت و چواردەورت کەل و پەلی بازرگانی بوو، ئەوە سەرۆکی‌یە بۆت لە کارەکەتدا، وە ئەگەر کەل و پەلی بازرگانیت بە دەستی خۆتەوە بینی وەکو کێشانەو ئەو جۆرە شتانە، ئەوە پارێزراو ئەبیت لە هەژاری.

۲۰-**بەروبوومی شیرین:** بینینی بەرو بوومی شیرین لە خەودا نیشانەیە لەسەر رۆزی حەلاڵ و زانستی بەسوود، بەروبوومی خۆشەویست نیشانەیە لەسەر رۆزی‌یەك کە بە ناڕەحەتی بە دەست ئەهێنرێ، وە خەو بینین بە کۆکردنەوەی بەرو بوومەوە نیشانەیە لەسەر

... ...بين له سامانێكى زۆر، ئەگەر خەوت بينى كچێك بەرو بوومى شيرين ئەخوات، ...نيشانەى ئەوەيە ئارەزوومەندان پێشبڕكێى خواستنى ئەكەن.

٢١ **بەروبوومى ترش**: بەروبوومى ترش لە خەودا بينين و كڕين و هەڵگرتنى و خواردنى نيشانەيە بۆ زياد بوونى نەخۆشى بۆ نەخۆش و زيادبوونى ماڵى حەرام بۆ لەش ساغ.

٢٢-**بەهەشت**: بينينى بەهەشت نيشانەى ئاشتىيە، وە چوونە ناوى مژدەيەو خواردنى بەروبوومى قسەى چاكەو خواردنەوە لە كانياوەكانى و پۆشين لە پۆشاكەكانى هيوا خۆشيى بە دەست هاتووە كە دێنە دى.

٢٣-**بريندارى**: ئەوەى بينى لە خەودا لاشەى بريندار بووە، ئەوە نيشانەى سامان و رۆزىيە، كە لە جەستەوە بۆى دێت، ئەوەى بينى بريندار بووەو خوێنى لێ نايەت ئەوە تووشى رێزو شەرەفى گەورە دەبێت.

٢٤-**برسيەتى**: برسيەتى لە خەودا نيشانەيە بۆ نەمانى سامان، سوور بوون لەسەر داواكردنى پشێوى، ئەڵێن ئەگەر خەوت بينى كەوا برسيت، ئەوە سامانێك وەرئەگرى لە كەسێكەوە يان سەرچاوەيەكەوە كە نايناسيت، وە ئەڵێن نيشانەى ئەوەيە لە رووى سامان و زانستەوە برسيتە، وە ئەگەر برسىيەكت بينى نيشانەيە بۆ هەواڵێكى خۆش كە لە هاورێيەكتەوە ئەبيستى، وە ئەڵێن برسيەتى لە خەودا نيشانەى بەغيلىيە بۆ برسيەكە.

٢٥-**بارى قورس**: بارى قورس لە خەودا نيشانەيە بۆ دراوسێى خراپ.

٢٦-**بەربەست**: بينينى بەربەست نيشانەيە بۆ بوونى رێگر لە ژيانتدا، بەڵام لە كۆتايىدا سەرئەكەويت بە سەرىداو كۆتايى دێت.

٢٧-**بێ نوێژى ئافرەت**: ئەگەر ئافرەت لە خەودا بينى بێ نوێژ بووە نيشانەيە لەسەر غەم و خەفەت، ئەگەر لە خەودا خۆى ئەشۆرد ئەوە غەمەكە ئەڕوا، ئەگەر كەسێكى بينى و بێزار بوو لە بێ نوێژىيەكە ئەو كوڕێكى ئەبێ.

**٢٨-باغی گیانداران:** ئەگەر خەوت بینی لە باخچەی گیاندارانیت نیشانەی ئەوەی گەشتێك ئەکەیت، وە بینی وەحشی بەستراوە لە قەفەزەکانیاندا بەڵگەیە بۆ سەرکەوتن و رۆزی‌یەك کە تووشت ئەبێ.

**٢٩-بڕۆی چاو:** ئەگەر خەوت بینی برۆکانت ئاشکران و تووکیان زۆرە ئەوە نیشانەی بەختیاری‌یە لە خۆشەویستیدا، بەڵام ئەگەر برۆکانت وەری بوون یان بێ تووك بوون ئەوە نیشانەی دۆڕانە.

**٣٠-بەندیی:** بەند بوون لە خەودا نیشانەیە بۆ ژێر دەستی و خەفەت، بەند بوون لە ماڵێکی نەزانراودا نیشانەیە لەسەر مردن و گۆڕ.

**٣١-بەرد:** بەرد لە خەودا نیشانەیە لەسەر دڵ رەقی.

**٣٢-بەرخ:** بەرخ لە گێڕانەوەدا کوڕێکی گوێ رایەڵە بۆ باوکی، ئەوەی بینی بەرخێکی بەخشی و ژنی سك پڕیشی هەبوو، ئەوە مژدەی کوڕێکی گوێ رایەڵی پێ ئەدرێ، وە بوون بە خاوەنی هەموو گیاندارێکی بچووك لە خەودا نیشانەیە بۆ دنیا تەنها بۆ کچ نەبێ، ئەوەی بینی بەرخێ سەر ئەبڕێ کوڕێکی ئەمرێ یان کەسێکی.

**٣٣-بەراز:** ئەگەر خەوت بینی بە بەرازەوە ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی خۆش بە، یان چاوەڕوان نەکراو.

**٣٤-بردن یان دزین:** هەرشتێ برێ و بدزرێ بە مەرجێ دزەکە نەبینرێ ئەوە فەوتاوەو ناگەڕێتەوە، وە ئەوەی دزەکەی تیادا بناسرێ یان شوێنەکەی یان گوم نەبووبێ لە چاوی خاوەنەکەیدا، ئەوە چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئەکرێ..

**٣٥-بۆن:** بۆنی گوڵاوی لە خەودا هەموو کاتێك نیشانەیە بۆ بەختیاریی و ئاسوودەیی.

**٣٦-بۆنی خۆش:** بۆنی خۆش لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاهەڵدان و باشەو قسەو کردەوەی چاك، وە بۆنی ناخۆش بە پێچەوانەوەیە نیشانەیە بۆ بەدکرداری و رەوشت نزمی لەناو خەڵکیدا.

٣٧-**بینی پێغەمبەرﷺ**: بینی پێغەمبەر محەمەدﷺ لە خەودا نیشانەی سەردانی گۆڕەکەیەتی، وە بینەرەکە پێغەمبەریﷺ بینیوە بە راستیی، چونکە شەیتان لە شێوەی پێغەمبەرداﷺ خۆی دەرناخات.

٣٨-**بەرد گرتنە خەڵك**: بەرد گرتنە خەڵك یان تیر یان فیشەك نیشانەی ئەوەیە باسیان ئەکات لە ناگاداریدا.

٣٩-**بارمتە (الرهن)**: بارمتە کراو لە خەودا، قەرزارە یان هەقی خوا یان هەقی خەڵکی بەلاوەیە..

٤٠- **بەخێوکردنی ئاژەڵ**: شوانیی ئاژەڵ لە خەودا نواندنێکی رەمزییە بۆ پەیامی مامۆستا.

٤١-**بەلەم**: ئەگەر بە دەریایەکی هێمندا ئەڕۆشتی ئەوە خەوێکی خۆشە، بەڵام ئەگەر دەریایەکی شەپۆلاوی بوو ئەوە نیشانەی دۆڕانە.

٤٢-**بازاڕ**: ئەگەر خەوت بینی لە بازاڕدایت و رووخۆشیت، ئەوە پیشەکی دۆڕانە.

٤٣-**بازنە**: بازنە لە خەودا بۆ ئافرەت نیشانەیە بۆ مێردەکەی وە بۆ کچ نیشانەیە بۆ داواکارەکەی، وە بۆ پیاو ئەگەر لە ئاڵتوون بێ نیشانەیە لەسەر تووش بوونی نارەحەتییەك لەوەی دەستی ئەکەوێ، ئەگەر زیو بوو ئەوە نیشانەی سامانێکە لە میراتێك بەشی ئەدرێ.

٤٤-**بەند کراو**: بینینی بەند کراو لە خەودا نیشانەیەکی خۆشە، چونکە خۆشترین ئاواتت دێتە دی.

٤٥-**بەرماڵی سەوز**: بەرماڵی سەوزو خۆش نیشانەیە بۆ ئامانج و هیوای خۆش و شیرین.

٤٦-**بەی - بەهێ**: بینینی بەی لە خەودا نیشانەیە بۆ تووش بوون و بەرگەگرتنی نارەحەتی و سزادان.

٤٧-**باڵکۆن**: ئەگەر لە خەودا لە باڵکۆنی ماڵەوە بوویت مانای گەڕان و گەیشتن بە ئاوانە.

٤٨-**بەرخ، کار:** بەرخ لە خەودا نیشانەیە بۆ ئافرەت ئەوەی بینی بەرخێکی هەیە ئەوە لەگەڵ عازەب جووت ئەبێ، وە ئەگەر هاوسەری هەبێ ئەوە کچێکی ئەبێ، ئەوەی بینی بەرخێ ئەدۆشێ ئەوە ئەو ساڵە خێرو رۆزیی رووی تێ ئەکات.

٤٩-**بەرد:** بەرد لە خەودا نیشانەی تەنگەتاوی‌یە، ئەگەر بە باشی سەرئەکەوتی بەسەریا ئەوە نارەحەتیەکەت ئەڕوا، وە دەرچوونی تاشە بەرد رزگار بوونە لە نارەحەتی و تەنگ و چەڵەمە.

٥٠-**بیابان:** بیابان لە خەودا نیشانەی هەست کردنە بە بۆشایی هەست و سۆز یان بێ ئەرزشی لە ژیانتدا، یان نارەحەتی لە کاروبارەکانتدا.

٥١-**بۆق:** ئەگەر بینیت بۆقێکت کوشت ئەوە بەسەر دوژمنەکەتدا سەرئەکەوی، وە بینینی کۆمەڵێك بۆق نیشانەیە بۆ نارەحەتی.

٥٢-**باڵندە:** بینینی باڵندە بە فڕیوی لە خەودا نیشانەی سەرکەوتن و باشی‌یە لە کاردا، وە نیشانەی گەشتە بۆ دەرەوە، وە نیشانەیە بۆ گەیشتن بە ئاوات، باڵندەی سپی نیشانەیە لەسەر خێرو ئاشتی و ئاسایش و چاکە، وە باڵندەی رەنگاو رەنگ نیشانەیە لەسەر جۆراو جۆری ئیش، وە باڵندەیەك ئەگەر ئەیخوێندو ئاسوودە بوو ئەوە بەختێکی خۆشە، وە ئەگەر نەیئەخوێند، ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ ماتەمینی کە لە زۆردارێکەوە روو ئەدات، وە ئەڵێن باڵندە لە خەودا ئاگاداری‌یە، ئەگەر نەناسراو بوو ئەوە نیشانەیە لەسەر فریشتەی مردن، ئەگەر ناسراو بوو ئەوە پیاوێکی خاوەن دەسەڵات و بەرێزە، ئەوەی بینی باڵندەیەکی گەورەی پێکاوە وەکو باڵندەیەکی تەواو ئەوە ماڵ و سامان و پلەو پایەو رێزی دەستگیر ئەبێ، بەڵام باڵندەی بەدخو وەکو قەلەڕەش و و کوندە بەبوو نیشانەی نەخۆشی و نارەحەتی‌یە، بەڵام باڵندەی ماڵ ئاوایی وەکو کۆترو چۆلەکەو مریشك و مراوی و قازو پەپوسلێمانە، ئەوە پیاوان و ئافرەتانی سوودمەندن، وە ماڵ و سامان دەستی خەو بینەکە ئەکەوێ، ئەوەی باڵندەیەکی بینی بە راسەریدا ئەفڕێ ئەوە سەرۆکی بە دەست ئەهێنێ، ئەگەر بینی لە جێگایەکدا ئەفڕی یان لە ماڵەکەیدا ئەوە فریشتەن، ئەوەی باڵندەیەکی بینی لە ئاسمانەوە هات و کەوتە نێوان هەردوو دەستی‌یەوە ئەوە مژدەیەکی

بەسەرهاوە، وە ئەڵێن باڵندە لە خەودا ئیشی خەو بینەکەیە لە ئاگاداریدا، ئەوەی باڵندەیەکی باشی هەبێت، کارەکەیشی باشە، وە ئەڵێن باڵندە لە خەودا ڕەمزە بۆ منداڵ.

٥٣-**بووك**: بووك لە خەودا ئەگەر ڕازێنرابوویەوە ئەوە دنیایەکی بەپیتە، ئەوەی بینی خۆی زاوایەو ژنەکەی نەبینی و نەیناسیەوە، وە بۆی دیاری نەکرابوو وە نەقۆزرابوویەوە بۆی و تەنها بوو بوو بە زاوا، ئەوە ئەمرێ یان مرۆڤێ ئەکوژێ، وە ئەگەر ئافرەتەکە دیاری کرابوو وە ناوی لێ نرابوو بۆ ئەم ئەوە لە پلەی ژن هێناندایە، وە ئەگەر بینی ژن نەهێنێ، ئەوە دەسەڵاتی دێتە دەست بە ڕادەی جوانی و ناوو ڕێزی ئەو ژنە.

٥٤-**بووکی زۆر**: خەو بە پێشوازی چەند بووکێکی زۆرەوەو ڕەت دانەوەی هەموویان، مانای وایە هیوای بڕیاردراوی هەیەبۆ هەڵبژاردنی بووکێکی چاك.

٥٥-**بووکی ڕەشتاڵە**: خەو بە پێشوازی کردنی ژنی ڕوخسار ڕەشەوە مانای وایە پرۆژەی داوا کردن و جووت بوونێکی نەگونجاو لە ئارادایە.

٥٦-**باوەش پیاکردن**: ئەوەی مردوویەك یان زیندوویەك باوەشی پیا بکات تەمەنی درێژ نەبێت، وە باوەش پیاکردن لە نێوان خۆشەویستاندا نیشانەی جووت بوونە، وە لە نێوان کەسانی تردا چاوەڕوان کردنی بەختێکی خێرایە..

٥٧-**باران**: باران لە خەودا بەزەیی‌یە، وە ئەڵێن زانست و دانایی و چاکی گوزەرانە، وە ئەڵێن باران قورئانی پیرۆزە.

٥٨-**بزر بوون**: خەو بینینت بە بزربوونی کەسێکەوە نیشانەی وایە ئەو کەسە بەم نزیکانە ئەگەڕێتەوە، وە ئەگەر بە هۆی دیار نەبوونی کەسێکەوە دلگران بوویت، مانای وایە پەشیمانی بە هۆی چەند وتەیەکی ڕەق کە لە کاتی توڕەییدا ئەیڵێیت، ئەگەر بەهۆی بزربوونی کەسێکەوە بەختەوەر بوویت ئەوە ڕزگارت ئەبێت لە ترسی دوژمنێ کە مەرج نی‌یە ئەو دوژمنە ئەو کەسە بێ کە خەو بە ون بوونیەوە ئەبینی.

٥٩-**بەرخ – مەڕ**: لە خەودا نیشانەیە لەسەر دەستکەوت و قازانج و جووت بوون و منداڵ، وە نیشانەیە لەسەر ئەوەی باش و چاك، بەرخ ئافرەتی بەڕێزو جوان و خاوەنی سامان و بە شەرەف، بزنیش مانای ئافرەتانی بەدڕەوشتن، ئەوەی بینی بەرخێکی زۆر بەرێ

ئەکات، ئەوە بەهێز ئەبێت، ئەگەر لە خوری و شیرەکەی هەلگرت ئەوە پارەی لێیان دەست ئەکەوێت، ئەگەر بوو بە خاوەنی مەڕ ئەوە غەنیمەی دەست ئەکەوێت. ئەگەر بە پێوە بینی ئەوە چەند پیاوێك لەو شوێنەدا کۆبوونەتەوە بۆ کارێك.

٦٠-**بێژنگ**: بەکارهێنانی بێژنگ لە خەودا رەمزە بۆ چوونە ناو نارەحەتی گەورەو کێشەی پەیوەندی دار بە کەسی خەو بینەوە.

٦١-**بیبەر**: خەو بینین بە بیبەرەوە مانای وایە پارێزگاری سامانەکانت ئەکەیت.

٦٢-**بەلەم**: ئەگەر بەلەمەکە بەهێواشی لە دەریایەکی هێمندا ئەرۆیشت، ئەوە چاوەڕوانی بەختەوەری بکە بە تایبەتی ئەگەر لە بەلەمەکەدا بیت، لەگەڵ چەند کەسێکی رووخۆشدا، بەلام ئەگەر بەلەمەکە تووشی دەریایەکی شەپۆلاوی هات، ئەوە ئاگاداری‌یە لە نارەحەتی‌یەك، کە هۆکەی چەند وتەیەکە لە کاتی تورەییدا پێی قایل بوویت.

٦٣-**بڕینی قاچ**: بڕینی قاچ لە خەودا نیشانەی حالەتێکی دەروونی‌یە بە هۆی کێشەیەکی زیندووی ئامادەباشەوە.

٦٤-**بڕینی قژ**: بڕینی قژ لە خەودا مانای نەمانی نارەحەتی‌یە، وە ئەڵێن کورت کردنەوەی قژ نیشانەیە لەسەر نەمانی هێز.

٦٥-**بازدان**: خەو بەوەی باز بەسەر دیوارێکی بەرزدا بدەیت مانای وایە بەرەنگاری نارەحەتی دەبیتەوە، بەلام ئەگەر بە ئاسانی باز بدەیت، ئەوە بە ئاسانی رزگارت ئەبێ، بەلام ئەگەر دیوارەکە بەرز بوو نەت ئەتوانی باز بدەیت بەسەریدا یان سەرکەوتیت بەسەریدا، ئەوە نارەحەتی‌یەکان سەخت ئەبن و خەفەتێکی گەورەت تووش دەبێ، بەلام ئەگەر خۆر لەو کاتە گەشاوە بوو ئەوە هەمووی کۆتایی دێت.

٦٦-**بێ تاقەتی**: بێ تاقەتی لە خەودا نیشانەی کێشەیە لەگەڵ هاوڕێ‌یەکدا، وە بێ تاقەتی کیژەکەت لە خەودا نیشانەی ژن هێنانی ئاسوودەتە.

٦٧-**بەروانکە**: بەروانکە لە خەودا پۆشاکە لە کاتی بە ئاگا بووندا، لە زستاندا باشترە وەك لە هاوین، بۆ بازرگان و پزیشك و ئەندازیارو مامۆستا بە پێی پلەی

پیشەکەیەتی، ئەگەر بەروانکەکەی بینی پیسە ئەوە گوزەرانی بەرەو خراپی ئەچێت و پلەو پایەیشی کەم دەکات.

**٦٨-بەران:** بەران لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاوێکی بەرهەڵستکار دوات کەوتبێ.

**٦٩-باران:** باران لە خەودا خێرو رۆزیی و رەحمەتە ، ئەگەر بارانەکە هێواش بوو نیشانەیە لەسەر ئاسوودەیی و سامان، ئەگەر بە هەورە گرمەوە بوو نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی و سامناکی، وە ئەگەر تایبەت بوو بە شوێنێکی دیاری کراو، ئەوە نیشانەیە لەسەر ماتەمینی خەڵکەکەی یان لەسەر غەمی خەو بینەکە، وە ئەگەر بارانەکە گشتی و زەرەرمەند بوو ئەوە نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی زۆر، وە بینینی باران لە پەنجەرەو دەرگاوە، یاخود خۆت لەبەر باراندا بوویت، ئەمانە هەموویان نیشانەیەکی چاکن، وە ئەگەر بارانەکە لە مارتدا تەواو بوویێت و خۆریش هەڵهاتبێت لە کاتی باریندا، ئەوە بەختێکی تا رادەیەك باشە، وە دڵنیابە باران بە هەر شێوەیەك بێت، مانای وایە ناڕەحەتیەکانت چەندە قورس بن ئەوە لە واقیعدا بە ئاسوودەیی یەکی دڵنیایی بۆت، کە لە پاشدا ئەیزانیت و تێ دەگەیت کە ئەو ناڕەحەتیانە بە بەرەکەت داپۆشراون، وە کەسێك هەیە کە تۆی زۆر خۆش دەوێت، ئەو بارانەی لە خەودا دەیبینیت نیشانەی ئەوەیە چەند دڵێکی پاك و خۆشەویستی گرنگیت پێ ئەدەن و بیرت لێ ئەکەنەوە..

**٧٠-بەندەر:** بەندەر لە خەودا نیشانەی هیواو ئاسایش و بەڵێن بە چاك بوونی دوا رۆژە، یان گەیشتنی هەواڵی خۆش لە کەسێکەوە کە لە دەرەوەی وڵاتە یان ئاگاداری بە گەشتێك بۆ دەرەوە.

**٧١-بالۆن:** هیوای درۆیەکە بە دۆران کۆتایی دێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر بالۆنەکە فری بە ئاسایش و بە بێ ناڕەحەتی ئەوە ناڕەحەتی یەکان کەم و ئاسان دەبن.

**٧٢-بزن:** ئەگەر بزنەکە سپی بوو لە خەوەکەداو لەش ساغیش بوو، ئەوە خەوێکی چاکە، وە ئەگەر لەسەر کەژێکی بەرز بوو یان لەسەر بەردێکی بەرز ئەوە بە دڵنیاییەوە سارات دەست گیر ئەبێ، وە هەروەها ئەگەر لە باخچەیەکدا یان شوێنێکی سەوزدا بینیت،

ئەگەر ڕەش بوو ئەوە بەختێکی باشە، بەڵام پارەکە کەمە، بەڵام ئەگەر نەخۆش یان لاواز بوو ئەوە ئاگاداری‌یە.

٧٣-**بزمار**: بزمار لە خەودا ڕەمزێکی سێکسی‌یە، وە نیشانەیە لەسەر هێزو سامان، وە لەسەر پیاوەتی کە خەڵکی بە هۆی ئەمەوە دەگەن بە کارەکانیان.

٧٤-**بیبەر**: خەو بە کڕینی بیبەر یان خواردنی نیشانەی ئەوەیە کارێکی خێر ئەکەیت و چاکەیەك ئەدەیتەوەو پەشیمان ئەبیتەوە لەوەی کە بەسەرچووە، وە ئەڵێن خەو بە خواردنی بیبەرەوە نیشانەی ئازاوە ناڕەحەتی تۆیە لەگەڵ کەسێکی نزیکتدا، یان هاوڕێیەکی خۆشەویستت، وە خەون بینی بەوەی کە لە باخچەیەکدایت یان کێڵگەیەك کە بیبەر دەچنیتەوە ئەوە ئاگاداری‌یە بۆت لە ئاژاوەیەکی داهاتوو.

٧٥-**بەیەکا چوون**: ئەگەر تووشی دەمە قاڵێ هاتی یان دەمەقاڵێت بینی، ئەوە چەند هەواڵێ دەبیستی کە تایبەتە بە خۆت یان بە هاوڕێیەکت.

٧٦-**بەرز کەرەوە**: سەرکەوتن بە بەرزکەرەوە لە خەودا ڕەمزە بۆ دەست کەوتنی پلەو پایە یان ئارەزوو بوون لێی.

٧٧-**بڕبەن**: بڕبەن لە خەودا نیشانەیە لەسەر زمانی مرۆڤ ئەگەر تیژ بوو ئەوە تیژیی زمانیەتی، وە ئەگەر سارد بوو ئەوە ڕێکی‌یەتی.

٧٨-**بیرە**: خەو بە ناوی ڕەزەوە خەرێکی چاکە، بە تایبەتی ئەگەر جۆرەکەی باش بێت، بەڵام ئەگەر ڕەزەکە مردوو بوو ئەوە ئاواتەکان پووچەڵن، بەڵام ئەگەر سەوز بێت یا کەمیش بێت یان ترێت لە ڕەزێ کۆ ئەکردەوە ئەوە هەموویان بەختی باشن، چونکە بەختێکی باشت دەستگیر ئەبێ و بە باشترین ئاواتت ئەگەیت لە ئیش و کارو خۆشەویستیدا.

٧٩-**بەڵێن**: ئەگەر لە خەودا بەڵێنت داو بردتە سەر لە هەموو کاتێکدا، ئەوە مانای وایە بەختەوەرییەکی گەورەت تووش ئەبێت، بەڵام ئەگەر بەڵێنەکەت نەبردە سەر نیشانەی دڕاندنە، ئەگەر لە خەودا کەسێك بەڵێنی پێدایت و نەیبردە سەر مانای وایە هاوڕێیەکی فێڵبازت هەیە، بەڵام ئەگەر بەڵێنەکەی بردە سەر ئەوە هاوڕێیەکەت پاکە،

ئەگەر لە خەودا بەڵێنێك دراو جێ بە جێ كرا ئەوە هەواڵی خۆش دەبیستی، بەڵام ئەگەر هاتوو بە جێ نەكرا ئەوە خراپە، پەیمان بە چاكە لە خەودا تووش بوونی خێرو قازانج و دەربری ئەمەنە، ئەوەی بەڵێنی خێری دا ئەوە تووشی خێرو ئاسایش ئەبێ.

٨٠-**بێزاری:** بێزاری و نائومێدی لە خەودا نیشانەی رزگار بوون و دەرووە.

٨١-**بادام:** بادامی شیرین نیشانەیە لەسەرماڵی حەڵاڵ و شیرینی نیمان وە بادامی تاڵ نیشانەیە لەسەر قسەی حەق و حەقیش تاڵە، ئەوەی بادام بخوات سامانێك بە دەست ئەهێنێ و چاك ئەبێتەوە لە نەخۆشی. بادامی سەوزیش لە كاتی خۆیدا نیشانەیە لەسەر چاكە.

٨٢-**بەر دەرگا:** بەردەرگا بریتییە لە ژن، چونكە دەرگا بریتییە لە مێرد.

٨٣-**باوێشك دان:** باوێشك دان نیشانەی نەخۆشییە.



**١-پەناگرتن بەخوا**:پەناگرتن بە خوا لە شەیتانی ڕەجم کراو. لە خەودا مانای وایە تۆ لە تەنگانەیەکی سەرسامدایت و خوای گەورە ڕزگارت ئەکات لە دوژمن یان ئێرەیی پێ بەرێ کە توشت دەبێ.

**٢-پاس**:پاس ڕەمزە بۆ خێرایی و جوڵە، سوار بوونی واتە بیرکردنەوەی خێرا هەیە لە هۆش و خەیاڵدا، وە دابەزین لە پاس واتە گەیشتنە بە ئەنجامێکی تەواو.

**٣-پێڵاو**: بەم شێوانەی خوارەوە لێك ئەدرێتەوە: ئەگەر پێڵاوی نوێت لە پێ کرد ئەوە دڵخۆش ئەبیت و خۆشەویستێکت زوو ئەتگاتێ، وە ئەگەر پێڵاوەکە کۆن ئەوە بوو ئەوە بەڵگەیە لەسەر جووت بوون، ئەگەر پەڕپووت بوو ئەوە بەڵگەیە لەسەر کلۆڵی، وە کون لە پێڵاودا بەڵگەیە لەسەر بوونی مونافەسەر کەر لەگەڵتا. وە حاڵەتی پێڵاوی خراپ ئاگادارییە بە دۆڕاندنێکی نزیك، پێڵاوی نوێش کە لە کاتی لەپێ کردندا ئێشی هەبێ ئەویش نیشانەی دۆڕاندنە، وە ئەگەر پێڵاوەکە نوێ بوو بەڵام تۆز نیشتبوو بەسەریەوە، ئەوە سەفەرێکی نزیك چاوەڕوانتە، وە ئەگەر پێڵاوەکەت لە خەودا ون کردو پێت پەتی بوو ئەوە ئاگادارییە بۆ نەخۆشی.

**٤-پەنجەکان**: پەنجەکان لە خەودا بە مانای منداڵ و ژن و مێرد و باوکان و دایکان و ماڵ و پیشەسازی دێت، ئەوەی بینی پەنجەکانی بە باشی زیادیان کردووە بەڵگەیە لەسەر زیاد بوونی باشە، وە کەم کردنی بەڵگەیە لەسەر کەم کردنی، لە کار کەوتنی پەنجەکان بەڵگەیە لەسەر نەتوانینی سوودی باوان یان منداڵان، وە ئەوەی بینی پەنجەکانی سپی و

پـاکن ئـەوە نیشـانەی چـاکەیە. وە ئەگـەر پـیس بـوون ئەوە نیشانەی دۆڕاندن و هەواڵی ناخۆشـە، ئـەوەی بینی پەنجەکانی دەگەزێ ئەگەر نەخۆش بوو دەمرێت، وە ئەگەر ساغ بوو ئـەوە زەرەرو زیانە، وە ئەوەی بینی پەنجەکانی قرتاون نیشانەیە لەسەر لاوازی منداڵەکانی یان خزمانی یان ناسیاوانی.

٥- **پاسکیل:** خـەو بینین بە سوار بوونی پاسکیلەوە بەرەو بەرزایی یان کەسێکت بەو شـێوەیە بـینی، ئـەوە بەڵێـنە بە چەند شتێکی چاك بەم نزیکانە، بەڵام ئەگەر کەسێکت بینی لە بەرزاییەوە دانەبەزێ ئاگاداری دۆڕاندن بە، وە ئەگەر پێشبڕکێی پاسکیلت بینی یـان ئـەو کەسەی سواری بووە بە خۆڕایی لـێی نەخورێ، ئەوە ئاگاداری تەندروستیت بە چونکە دووچاری نەخۆشیەکی گەورە دێیت.

٦- **پاقلەمەنی:** هەموو جۆرەکانی پاقلەمەنی وشك لە خەودا بێز لـێ کراوە، چونکە چەوری و شیرینی تێدا نییە، وە نیشانەیە لەسەر ہەژارەیی کاتیی.

٧- **پۆلکە:** خەو بینین بە پۆلکەوە نیشانەیە بـ سەرکەوتن.

٨- **پیاز:** خەوەکانی پیازو سیرو کەوەرو تور ماناي درکاندنی نهێنی دەگەیەنن، جنینی پیاز لە خەودا نیشانەیە لەسەر مەرایی بۆ پیاویا.

٩- **پشکنین:** پشکنین لە خەودا ئاگادارییە لە نەخۆش کەوتنی هاوڕێیەك یان خزمێك لە هەمان کاتدا نیشانەی بەختێکی ئاسوودەیە.

١٠- **پەشـیمان بوونـەوە:** پەشـیمان بوونەوە (تەوبە) لە خەودا نیشانەی رزگاربوونە، هەروەها نیشانەیە لەسەر تووش بوونی پیرۆزییەکی گەورەو بەفەر.

١١- **پۆشـاك:** پۆشـاك لـە خـەودا نیشـانەیە لەسەر گوزەران و داپۆشین و ئایین، هەر شتێکی تێدا بوو لە درێژیی و کورتی و پاکی و پیسی ئەوە لە ئایین و گوزەراندایە.

١٢- **پۆشاکی خوری:** پۆشینی پۆشاکی خوری لە خەودا نیشانەیە لەسەر خواپەرستن و نەڵێن نیشانەیە بۆ دەوڵەمەندی و خۆش گوزەرانی.

١٣- **پۆشـاکی سـەوز:** پۆشـینی پۆشـاکی سەوز لە خەودا بۆ زیندوو نیشانەیە لەسەر خواپەرستن و ئاسایش، وە بۆ مردوو نیشانەیە لەسەر چاکی گوزەران.

١٤- **پۆشاكی سپی:** پۆشینی پۆشاكی سپی لە خەودا نیشانەیە لەسەر پاكێتی و جوانی دین و دنیا.

١٥- **پۆشاكی سوور:** پۆشینی پۆشاكی سوور لە خەودا خۆشەویستی و ئارەزوو شەیتانە.

١٦- **پۆشاكی رەش:** پۆشینی پۆشاكی رەش لە خەودا پایە بەرزیی و رێزو سامانە بۆ كەسێ لە ئاگاداریدا خوی بە پۆشینییەوە گرتبێت، وە باش نی‌یە بۆ كەسێك لە ئاگاداری‌دا خوی بە پۆشینیەوە نەگرتبێت.

١٧- **پرد:** ئەگەر بەسەر پردێكدا پەڕیتەوە ئەوە ئینەكەت یان خانوەكەت ئەگۆڕی بۆ چاكتر، وە ئەگەر پردێكی رووخاوت بینی ئەوە ئاگاداری‌یە لە دوژمنێ كە ئەیەوێ زیانت پێ بگەیەنێ، بەڵام ئەگەر رووخانی پردێكت بینی ئەوە نیشانەی دۆڕاندنە.

١٨- **پێست:** پێست لە خەودا نیشانەیە لەسەر داپۆشینی مرۆڤ لە ژیان و مردنیدا.

١٩- **پەنیر:** ئەوەی پەیوەندی بە پەنیرەوە هەیە خواردنی و فرۆشتنی و كڕینی نیشانەی دۆڕاندنە.

٢٠- **پێ پەتی:** پێ پەتی بوون لە خەودا ناڕەحەتی و غەمە، ئەوەی بینی بە پێی پەتی دەڕوات ئەوە قەرزو ناخۆشی تووش ئەبێ، وە ئەوەی بینی بە تاكێ نەعلەوە ئەگەڕێ ئەوە شەریكەكەی لێی جیا ئەبێتەوە.

٢١- **پێڵاوی ون بوو:** ئەو پێڵاوەی لە خەودا ون ئەبێت مانای زیان و دۆڕاندن و دڵە راوكێیە، وە ون بوونی پێڵاوی كەسێكی تریش خۆش گوزەرانی نی‌یە.

٢٢- **پۆشاكی سەوز:** پۆشاكی سەوز لە خەودا نیشانەیە لەسەر چاكی ئایین و ئاسایش و هیواو بە گوڕی و هەروەها هێزی ئایینە بۆ زیندووان و گوزەران باشی‌یە بۆ مردووان.

٢٣- **پەت:** پەت لە خەودا بەڵگەیە، ئەوەی بینی پەتێكی پێیە ئەوە داوای بەڵگە ئەكات لە كارێك لە كارەكانی، یان بینی ئەیەوێ پەتێ بكاتەوە یان بە خۆیدا بیپێچێ یان بە قامیشێكدا یان تەختەیەك ئەوە نیشانەیە لەسەر گەشت، وە پەتی ئاڵۆز لە خەودا نیشانەی جادووەو پەتی سپی نیشانەیە لەسەر بەیانی و رەشیش نیشانەیە لەسەر شەو.

٢٤ **پێدان**: ئەگەر لە خەودا پارەیەکت دا بە کەسێ نیشانەیە لەسەر ناکۆکی بەهۆی ...... خراپەوە، وە ئەگەر پارەت وەرگرت ئەوە نیشانەیە لەسەر دەولەمەند بوونت ئەگەر ...ای ئەوە بێت.

٢٥ **پیاو**: ئەو پیاوەی لە خەودا ئەیبینیت ئەوە تۆی، حاڵی چۆن بێ لە تەندروستی و هێزو پلەو پایە ئەوە بۆ تۆیە، وە ئەو پیاوە نەناسراوەی ناینناسیت ئەگەر لاو بوو ئەوە دوژمنە، وە ئەگەر پیر بوو ئەوە ئاسوودەیی و بەختێکە کە ئاواتی ئەخوازی، وە بینینی خەڵك لە خەودا نیشانەیە لەسەر دادگەری کردن، وە بینینی فەرمانڕەوایان ترسە، وە بینینی سەرباز مەینەتی و نارەحەتی‌یە وە بینینی پیشەساز رۆزی‌یە، بینینی ئافرەت فیتنەیە، وە بینینی پیاوچاکان خواپەرستی‌یە.

٢٦- **پلەو پایە**: پلەو پایە لە خەودا بۆ گۆڕانی گوزەران نیشانەیە لەسەر ژن یان گوزەران یان شتێکی چاك کە بەرزت ئەکاتەوە.

٢٧- **پاوێکی بێ زیان لە دەریادا**: پیاوێکی بێ زیان لە دەریادا گەشبینی‌یەکی باش و سەرکەوتنێکی گەورەیە.

٢٨- **پیاوێك بخنکێ لە دەریادا**: بەختیاری و سەرکەوتن و پێشکەوتنە.

٢٩- **پاوانە**: ئەگەر ئافرەت خەوی بینی بە پاوانەوە نیشانەی شوورکردنێکی نزیکە، ئەگەر پیاو خەوی پێوە بینی مانای وایە داهاتووی ژیانی بە بەستراوەیی دەمێنێتەوە.

٣٠- **پەڕ**: پەڕ لە خەودا سامانەو نیشانەیە لەسەر پۆشاك، وە ئەڵێن ئەگەر رەنگی پەڕەکە دلگیر بێت ئەوە چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش بە، بەڵام ئەگەر رەش بوو ئەوە هەواڵەکەی ناخۆشە، وە ئەگەر پەڕەکە رەش و پاك بوو ئەوە هەواڵەکە خراپەو بە راستیی نی‌یە، ئەوەی بینی پەڕو دوو باڵی هەیە، ئەوە ماڵێکی زۆری دەستگیر ئەبێ، ئەگەر فڕی نیشانەی ئەوەیە کە گەشت ئەکات.

٣١- **پێشبڕکێ**: پێشبڕکێ لە خەودا بیستنی هەواڵی خۆشە، خۆ ئەگەر سەرکەوتوو بوویت لە پێشبڕکێ‌یەکەدا ئەوا هەواڵەکە زۆر خۆش دەبێت.

٣٢- **پلیکانە:** پلیکانەی بەرز لە خەودا نیشانەیە لەسەر وەڵامدانەوەی ئارەزووەکانت، سەرکەوتنی پلیکانە نیشانەیە لەسەر بەرز بوونەوەی پلەو پایەت و بەختیاریت و ئیشەکەت و خۆشەویستەکەت، دابەزینت لە پلیکانە لە خەودا نیشانەیە لەسەر دۆڕاندن و دابەزینی ئاسان، مەگەر پلیکانەکە شکاو بێت یان لە کاتی دابەزیندا بترسیت، وە بینینی کەسێکی تر کە سەرکەوێت بەسەر پلیکانەدا ئەوە هەواڵێکی خۆشت پێ ئەگات، ئەگەر ئەو کەسە ئەهاتە خوار لە پلیکانەکە ئەوە هەواڵەکە ناخۆشە.

٣٣- **پیری:** پیری لە خەودا ویقارو رێزەو نیشانەیە لەسەر لاواز بوون ئەگەر لە ریش و سەردا بێت، وە ئەڵێن نیشانەیە لەسەر تەمەن درێژیی، وە ئەڵێن نیشانەیە لەسەر هەژاریی، ئەوەی بینی لە ریشیدا پیریی پێوە دیارەو تەواو سپی نەبووە، ئەوە هێزو رێزە، ئەوەی خۆی بە پیری بینییەوەو ئافرەتێکی سك پڕی هەبوونەوە کوڕێکی دەبێت، ئەگەر ئافرەت لە قژی خۆیدا پیریی بەدی ئەکرد ئەوە مێردەکەی پیاوێکی فاسقە، وە پیر بوونی مووی لاشە بۆ دەوڵەمەند زیانە لە سامان وە بۆ هەژار قەرزەو پیر بوونی نەخۆش مردنیەتی و کفن کردنیەتی، وە پیریی بۆ ترسنۆك ئاسایشە.

٣٤- **پیرەمێرد:** پیرەمێرد لە خەودا بە پۆشاکی سەوزەوە رەمزی خاوەندارییە، وە بە پۆشاکی خاوێنی سپی و روخساری گەشەوە رەمزە بۆ بەختێکی باش، وە بە پۆشاکی پیس و شڕو رووخساری ناشیرینەوە نیشانەی بۆ بەختی خراپ.

٣٥- **پۆلیس:** بینینی پۆلیس لە خەودا نیشانەیە لەسەر بڵندی و پایە بەرزی، چونکە لە پیاوانی دادو یاساوەیە.

٣٦- **پێکەنینی ئاسایی:** نیشانەیە بۆ سەرکەوتن و ئاسوودەیی.

٣٧- **پێکەنینی قاقا:** پێکەنین بە قاقا نیشانەیە لەسەر گریان.

٣٨- **پێکەنین لەگەڵ هاوڕێدا:** پێکەنین لەگەڵ هاوڕێ لە خەودا نیشانەیە بۆ تێکچوون لە ئاگاداریدا.

٣٩- **پێکەنین لەگەڵ ژندا:** پێکەنین لەگەڵ ژن لە خەودا مانای تەڵاقدانیەتی.

٤٠- **پێکەنین بە بێ قاقا:** پێکەنین بە بێ قاقا نیشانەیە لەسەر خۆشی و ئاسوودەیی.

٤١- **پەراسوو**: پەراسووەکان لە خەودا ئافرەتانی ناو ماڵە، هەر شتێ بەسەر پەراسووەکاندا روو بدات، هەمان شت بەسەر ئافرەتەکاندا روو ئەدات.

٤٢- **پێچەوانە**: دژ لە خەودا باشی دژەکە نیشان ئەدات، هەر شتێکی باشی تێدا بێت ئەوە بۆ تۆیە، وە هەر شتێکی جوان و تەندروستی لە تۆ هەبێت ئەوە بۆ ئەو، پێچەوانەش بە پێچەوانەوەیە.

٤٣- **پزیشك**: نەخۆش ئەگەر لە خەودا پزیشکی بینی ئەوە نیشانەی مردنیەتی، وە ئەگەر لەش ساغ پزیشکی بینی ئەوە نیشانەیە لەسەر هاوڕێیەك کە لە ژیاندا یارمەتی ئەدات، وە ئەگەر ئافرەتێکی بێ مێردی بینی ئەوە شوو ئەکات، وە ئەگەر شووی کردبوو ئەوە نیشانەیە بۆ کاری باش.

٤٤- **پزیشکی ددان**: خەوت بە پزیشکی ددانەوە خەوێکی باش نییە، چونکە نیشانەیە بۆ نەخۆشی، بەڵام ئەگەر بینیت دوور ئەکەوتەوە لێت یان تۆ جێگاکەی بە جێ ئەهێڵی مانای وایە ناخۆشترین کاروبار بەسەرچوو.

٤٥- **پەیمان بەستن**: پەیمان بەستن لە خەودا نیشانەیەکی باشە، ئەڵێن مژدەیەکی چاکەو ئیشێکی نوێیە.

٤٦- **پیر**: ئافرەتی پیر لە خەدا پەککەوتنە، وە نیشانەی دنیای بەسەر چووە، سەردانی پیری نەناسراو بۆ ... ی نەخۆش لە خەودا ئەوە ئەترسێ بمرێ، ئەوەی پیرێکی نەشیرینی بینی ئەوە نیشانەی دووبەرەکییە، بەڵام ئەگەر پیرە مێرد باش بوو لەگەڵتا ئەوە خەوێکی باشە، بە تایبەتی ئەگەر خەو بینەکە ئافرەت بێت. بینینی کۆمەڵە پیرێك لە خەودا کە لەگەڵ یەکدا بدوێن نیشانەی هاوڕێیەکی فێڵبازە.

٤٧- **پارەو دراوی رسوا**: پارەو دراوی رسوا نیشانەی سەرکەوتنە لە ئیشدا.

٤٨- **پەرۆش**: پەرۆشی لە خەودا نیشانەیە لەسەر پێ داگرتن، ئەوەی لە خەودا بینی پەرۆشە، ئەوە سوورە لەسەر کارەکەی، ئەوەی بینی پەرۆشە لەسەر شتێ ئەوە سوورە لەسەر سامانی دنیا.

٤٩- **پێنووس**: پێنووس لە خەودا زانستە، ئەوەی لە خەدا بینی پێنووسێکی پێیە، ئەوە زانستی دەستگیر ئەبێ. وە نیشانەیە لەسەر ئەو شتەی مرۆڤی پێ یاد دەکرێتەوە لە سامان یان کوڕ یان زانست یان پلەو پایە یان رەوشت، لە کاتێکدا پێنووسەکە بنووسێت، بەڵام ئەگەر نەنووسێت ئەوە نیشانەیە لەسەر نارەحەتی‌یەکان و کێشەو دژواریی زۆر، وە ئەڵێن ئەگەر پێنووسەکە پێی بنووسرێت لەسەر کاغەزێك ئەوە رەمزێکی سێکسی‌یە، بۆ عازەب نیشانەی کاری سێکسی‌یە، وە بۆ نووسەر پاراستنیەتی لە هەژاریی لە پیشەکەیدا.

٥٠- **پشیلە**: پشیلەی نێر لە خەودا دزە، وە ئەڵێن رەمزە بۆ ناپاکی و رق لێ بوون و زیانە، وە خەونەکانی پشیلە لە خۆشەویستیدا ناپاکی‌یە، وە لە جووت بووندا ناپاکی ژنە یان مێرد، وە لە منداڵاندا ناپاکیانە.

٥١- **پشیلەی بچووك**: بینینی پشیلەی بچووك لە خەودا یاری بکات و باز بدات خەوێکی ی زۆر چاکەو نیشانەی کت و پڕی‌یەکی ناسوودەیە، بەڵام ئەگەر پشیلەکان نەخۆش بوون یان مردوو بوون ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ دۆڕاندن.

٥٢- **پشیلەی مێ**: خەو بە پشیلەی مێی گەوردە مانای دەستگیر بوونی دەستکەوتێکی بەپیتە، وە ئەڵێن ئەگەر پشیلە مێ‌یەکە قەڵەو بوو ئەوە بەختت باش دەبێت، بەڵام ئەگەر برسی و پشتگوێ خرابوو ئەوە کەسێك داوای یارمەتیت لێ دەکات.

٥٣- **پەلکە زێڕینە**: باشترین جۆری خەوە بە تایبەتی ئەگەر بە ئاشکراو گەشاوەیی و لە هەوایەکی سافدا بینیت، لەو کاتەدا چاوەڕوانی هەواڵی خۆش بە، چونکە کارەکەت بەرەو باشتر دەگۆڕێت، وە ئەگەر ژنت نەهێنابێ ئەوەی خۆشت ئەوێ شایستەی خۆشەویستی‌یەکەتە، ئەگەر پەلکەکە گەورە بوو وە لە کۆتایی‌یەکەیەوە دەگەشایەوە ئەوە نیشانەی سەفەرە بۆ وڵاتێکی دوور یان هەڵس و کەوتە لەگەڵ کەسێکدا کە دەریا جیاتان دەکاتەوە لە یەك، بە زۆریی نیشانەیەکی چاکە، وە ئەگەر خەوت بینی کە پەلکە زێڕینە نابینیت بەڵام لە بارەیەوە دەخوێنیتەوە، یان کەسێك هەواڵیت پێ ئە گەیەنێ، ئەوە هەواڵێکی خۆش ئەبیستی.

٥٤ **پەلکە زێڕینەی سەوز:** لە خەودا نیشانەی ئاسایشە.

٥٥ **پەلکە زێڕینەی زەرد:** لە خەودا نیشانەی نەخۆشی‌یە.

٥٦- **پەلکە زێڕینەی سوور:** لە خەودا نیشانەی خوێن ڕشتنە.

٥٧- **پووش:** پووش لە خەودا سامانە، وە بینینی پووش فەوتانی ئەو سامانە لەنوێنێت.

٥٨- **پۆشاك:** پۆشاکی باش لە خەودا نیشانەیە لەسەر گوزەرانی باش و ئایین و زیاتر داپۆشین و پەیوەندی باشی ژن و مێردایەتی، ئەگەر کۆن بوو ئەوە خراپە، بەڵام خراپێکی ئاسان، وە ئەگەر نوێ بێت ئەوە خراپترە بۆ کەسێك لەبەری بکات، جلی پیاوانە نیشانەن بۆ پیاوان و جلی ژنانەش نیشانەیە لەسەر ژنان، وە بۆ خەو بینەکە پۆشاکی نوێ لە کۆن باشترە، وە پۆشاکی تەسك نارەحەتی‌یە یان کۆبوونەوەیە بۆ ئامادە نەبووان یان جووت بوونە بۆ عازەب، وە پۆشاکی پاشایان یان سەرکردەکان یان وەزیرەکان یان ئەمیرەکان بەرزی و بڵندی‌یە، وە پۆشینی پۆشاکی سەرباز جەنگەو پۆشینی پۆشاکی زانا زانستەو کارەو پۆشاکی فرۆشیار ماندوو بوون و هەوڵدانە، وە پۆشاکی سپی حەیاو شەرمەو پۆشاکی ڕەش شادی و سەربەرزی‌یەو پۆشاکی سەوز بڕوانامەیەو پۆشاکی خوری ڕووناکی‌یە، مەگەر زبرو شیاو نەبێت ئەوە نیشانەی هەژاری‌یە..

وە پۆشاکی درێژ بۆ کەسێك بێجگە لەبەرکەرەکە سەرپێچی‌یە، وە پۆشاکی کورت پاکی‌یە بۆ کەسێك پێی بکەوێت، وە پۆشینی جبە تەمەن درێژیی‌یە، وە پۆشاکە جوان و ڕازاوەکان سامان و کەل و پەلە یان ئافرەتی جوانە، ئەگەر خەوت بینی پۆشاکی نوێت لەبەر کرد مانای جووت بوونە یان گۆڕان بەرەو باشتر، وە پۆشاکی بە کۆمەڵ نیشانەی مردنی کەسێکی ئازیزە، ئەگەر لە خەودا ئافرەتێکت بینی بە پۆشاکی نوێوە ئەوە نیشانەی خۆشەویستی‌یەکی نوێ‌یە، وە ئەڵێن ئەگەر پۆشاکەکە خاوێن بێت ئەوە خەوەکە چاکە، بەڵام ئەگەر پیس یان شڕ بێت ئەوە نیشانەی دۆڕاندن و بێزاری‌یە، وە پۆشاکی ئاسایی نیشانەیە لەسەر دەستکەوتنی گەورەیی‌یەك بە هەوڵی تایبەتی یان هەوڵی هاوڕێیان.

٥٩- **پێشبڕکێ**: پێشبڕکێ لە کاردا ئەگەر بەرامبەرەکەت هەڵخەڵەتاندو لە خەودا لێت بردەوە، ئەوە لە ئاگاداریدا سەرئەکەوی بە سەریدا، بەڵام ئەگەر ئەو سەرکەوت بەسەر تۆدا ئەوە لە کارەکەتدا سەرئەکەوێ بەسەرتدا، وە پێشبڕکێ لە کاری خۆشەویستیدا مانای نزیك بوونەوەیە لە خۆشەویست.

٦٠- **پشتی**: پشتی لە خەودا ئەگەر نەرم و نۆڵ بوو ئەوە خەوێکی چاکە، بەڵام ئەگەر ناڕەحەت بوو ئەوە نیشانەی دۆڕاندنە.

٦١- **پانکە**: پانکە لە خەودا بۆ هەموو کەسێ نیشانەی حەسانەوەیە لە کاتی ناڕەحەتی و خەم و خەفەتدا، لە خەودا ئەگەر پانکەیەکت هەڵگرت یان کڕیت، مانای وایە تۆ تاقی کردنەوەیەکی خۆشت تووش ئەبێ ، ئەگەر شکاو بوو ئەوە خۆشی‌یەکە هەر دێت با دواش بکەوێت، وە ئەگەر لە خەودا کەسێکی تر بە پانکە هەوای بۆ تۆ دەهێنا ئەوە جووت بوونێکی خێراو ئاسوودە لە ئارادایە، یان بە لای کەمەوە پەیوەندی‌یە لە جووت بووندا.

٦٢- **پاشا**: ئەگەر پاشایەکت لە خەودا بینی ئەوە دەسەڵات یان ناوبانگ بە دەست ئەهێنی، ئەگەر بینیت لەگەڵی‌دا ئەدوایت، ئەوە نیشانەی ئەنجامدانی پەرژەوەندی‌یەکە یان پێویستی‌یەك، خەوت بە یەکێ لە پاشایانەوە لە باشترینی خەوە چاوەڕوان کراوەکانە.

٦٣- **پاشا ژن**: بینینی شاژن مانای وایە تۆ تووشی بەختێکی ئاسوودە دەبیت، بە تایبەتی ئەگەر ئەو پۆشاکی شاژنی لەبەردا بێت.

٦٤- **پارێزەر**: پارێزەر لە خەودا نیشانەی ناڕەحەتی‌یە بە هۆی تێکچوون لەگەڵ هاوڕێ یان دراوسێدا، بەڵام ئەگەر پارێزەرەکەت بە خەندەوە بینی یان داواکاری‌یەکە بە قازانجی تۆ تەواو دەبوو ئەوە ناڕەحەتی‌یەکان نامێنن.

٦٥- **پالایشگا**: پالایشگا لە خەودا رەمزە بۆ خزمەتکاری جوان و گوێ رایەڵ.

٦٦- **پێغەمبەر**ﷺ: بینینی پێغەمبەرمان محمدﷺ لەسەر شێوازی موبارەکی بینینێکی راستەقینەیە بە پێی فەرموودەی (ئەوەی لە خەودا بمبینێ وەکو ئەوە وایە بە

راستی ببینێ، شەیتان خۆی لە شێوازی پێغەمبەردا نیشان نادات)[1] ئەمەش لەسەر پەرستن و ڕێنمایی خوای گەورە بە دەست دێت، وە هەروەها بینینی پێغەمبەران -درودی خوایان لەسەر بێت- نیشانەیە لەسەر مژدە دان، ئەگەر لەسەر شێوەو ڕووخساری گونجاویان ببینرێن.. بینینی پێغەمبەران دوو جۆرە، ئەوەیە کە پێغەمبەرێ ببینی لەسەر شێوازو ڕووخساری، ئەمەش نیشانەیە لەسەر چاکی حاڵی خەو بینەکەو بەرزی و بێ هەڵەیی و ڕزگار بوونی لە دوژمنەکانی، وە ئەگەر بینی شێوازیان گۆڕا بوو وە گرژ بوو ئەوە نیشانەیە لەسەر خراپی حاڵی خەو بینەکەو زۆر نارەحەت بوونی، پاشان خوا دەرووی لێ ئەکاتەوە، ئەوەی پێغەمبەرێ ببینێ قسەی لەگەڵدا ئەکات، ئەگەر قسەکە چاك بوو ئەوە سوودو سەربەرزیی و شەرەفی لە نێو خەڵکیدا دەستگیر ئەبێ.

٦٧- **پارچە دار:** ئەگەر لە خەودا پارچە دارێکت ئەسووتاند ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی خۆش ببە، ئەگەر خەوت بینی ئاگرت تیا ئەکردەوە ئەوە شتێکی زیان بەخش ئەکەیت یان ئەلێیت، مەگەر دوورکەوتبیتەوە لێی و خۆتت پاراستبێ لێی، خەو بەوەوە کە تەختە ئەبڕیتەوە بۆ پارچە نیشانەی ئەوەیە کەسێکی نامۆ سەر لە ماڵەکەت ئەدا، ئەگەر کەسێکت بینی پارچە داری ئەبڕییەوە یان بیستن بەو هەواڵە نیشانەی ئەوەیە هەواڵی چاوەڕوانکراوت بۆ دێ لە دوورەوە.

٦٨- **پڵنگ:** پڵنگ ئەگەر زیندوو بێت لە خەودا ئەوە نیشانەی سەرکەوتنێکی گەورەیە لە کاردا، وە ئەگەر لە قەفەزدا بێت ئەوە ئاگاداری‌یە بۆت لە ترسناکییەکی سزیك کە لە زۆر کاتدا ناگات بە لاشەت، بەڵکو بە بیرو هۆشت دەگات، ئەگەر لە خەودا پڵنگێ هێرشی بۆ دەهێنای ئەوە باشە ئەگەر تۆ ڕا بکەیت لێی یان ئاگادارییە لە نارەحەتی نوێ ئەگەر پڵنگەکە دەستگیرت بکات.

٦٩- **پەنجەرە:** ئەگەر خەوت بینی لە پەنجەرەوە سەیر دەکەیت، ئەوە هەواڵ لە دوورەوە دەبیستیت، وە ئەگەر سەیری تاریکیت دەکرد یان شێوەیەکی ناقۆلا، ئەوە

---

(١) حديث: {من رآني في النوم فكأنه رآني حقيقة... إن الشيطان لا تتمثل بالأنبياء}.

هەواڵەکان ناخۆشن، وە خەو بە پەنجەرەی شکاوەوە نیشانەی دۆڕاندنە، وە خەو بە کەوتن لە پەنجەردوە نیشانەی ناگاداری‌یە لە ترسناکی.

٧٠- **پەیکەر:** بینینی بت و پەیکەر لە خەودا نیشانەی ئاسایشە لە ترس و سەرکەوتن بەسەر دوژمندا، وە نیشانەیە لەسەر ماڵ و منداڵ و ژن و مێرد، وە بینینی ئێسکە پەیکەر نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی‌یەکانی ماڵەوە.

٧١- **پیسی:** پیسی بە جلەوە یان بە لاشەوە یان قژەوە لە خەودا نیشانەی خەفەتە بۆ خاوەن خەوەکە، وە پۆشاکی پیس نیشانەی گوناهە بە قەدەر رادەی پیسی‌یەکە.

٧٢- **پەڕ:** بینینی پەڕی سپی مانای وایە هەواڵ لە دوورەوە دەبیستیت.

٧٣- **پریشکی ئاگر:** پریشکی ئاگر لە خەودا قسەی ناقۆڵایە، ئەوەی پریشکە ئاگرێکی بینی هۆش دێنێتە سەری ئەوە قسەیەك دەبیستێ کە پێی رازی نی‌یە، ئەگەر دووکەڵی بە پریشکی ئاگرەکەوە بینی نیشانەیە لەسەر گەورەیی و ناڕەحەتی کارەکە.

٧٤- **پەتا:** پەتا لە خەودا ئازارە تووشی خەڵکی دەبێ لە لایەن دادگەرێکەوە لە بەندیخانەدا، یان نیازی خراپەیە.

٧٥- **پۆلیس:** بینینی پۆلیس نیشانەیە لەسەر تێکچوونی خێزانی، مەگەر پەیوەندیت هەبێ لەگەڵ پۆلیسێکدا ئەوە ئەو کاتە خەوەکەی مانای نی‌یە.

# ( ت )

١-**تەوبە كردن:** تەوبە كردن لە خەودا نیشانەیە لەسەر فراوانی رۆزی، ئەوەی تەوبەی كرد بێجگە لە نوێژدا، مانای تەمەن درێژیی و سەركەوتنیەتی وە ئەوەی داوای تەوبەی كرد لە خوا لە نوێژدا خوا لـێی خۆش ئەبێت و رۆزی دەدات بە ماڵ و منداڵی، وە تەوبە كردن لە پاش نوێژو روو لە قیبلە ئەوە وەڵامی دوعاكەی دەدرێتەوە.

٢-**تاوانبار كردن:** تاوانبار كردنت لە لایەن پیاوێكەوە نیشانەی سەركەوتنتە، وە لە لایەن ئافرەتێكەوە نیشانەیە لەسەر هەواڵێكی ناخۆش.

٣-**تەقینەوە:** خەونی تەقینەوە هەست كردنە بە تاوان وە تەقینەوەی بۆمب بەڵگەیە لەسەر ناكۆكی نێوان ژن و مێرد.

٤-**تارمە (بالكۆن):** ئەگەر لە خەودا خۆت بینییەوە لە تارمەدا وەستاویت مانای بەخت باشی و گەیشتنە بە ئاوات، وە مانای تێڕوانینە بۆ پاشە رۆژو هیوار ئاواتی گەورە.

٥-**تفەنگ:** فیشەك تەقاندن بە تفەنگ لە خەودا نیشانەیە لەسەر كێشەی ترسناك، ماوەیەك درێژە ئەكێشێت پاشان نامێنێت.

٦-**تۆو:** هەر تۆوێك كە دەكرێتە سەر زەوی ئەوە نیشانەی لە دایك بوونێكی نوێیە، بەڵام تۆوی دەرمان ئەوە نیشانەیە بۆ زانست و خواپەرستی.

٧-**تف:** تف لە خەودا نیشانەیە لەسەر هێزی پیاو، ئەوەی بینی تفەكەی وشك بوویەوە ئەوە ناتوانێت ئەو شتە بكات كە ئەیەوێت و دواندن و قسەی كەم دەبێتەوە، ئەوەی بینی لە دەمیەوە كەفی ئەچەڕاند ئەوە نیشانەیە لەسەر بێ مانایی لە قسەكانیدا.

٨-**تـــاج**: تـــاج لـــه خـــەودا پایـــه بەرزی و دەسەلاته، یان لەوانەیه ژنێکی دەوڵەمەند بخـوازێ، یان دەبیته سەرۆك کار یان سەرۆك خێزان، وه بۆ ئافرەتیش مێردەکەی پایه بەرزو خۆش گوزەران دەبێت، بۆ کچیش شووکردنێکی ئاسوودەیه.

٩-**توو**: خواردنی توو له خەودا نیشانەی به دەست هێنانی رۆزیی‌یەکی زۆره.

١٠-**تەسبیحات**: تەسبیحاتی خوا له خەودا نیشانەیه لەسەر باوەڕو چاکه، وه نیشانەی رزگار بوون و دۆزینەوەی غەمەکانه.

١١-**تیمســاح**: خـەو بیـنین بـه تیمساحەوه مانای وایه دوژمنێکت هەیه، وه کوشتنی تیمساح له خەودا سەرکەوتنه بەسەر دوژمندا.

١٢-**تابووت**: ئەوەی له خەودا بینی به دوای تابووتێکەوەیه، ئەوه دوای سەرکردەیەکی گومـڕا کـەوتووه، وه ئەوەی خۆی لەناو تابووتدا بینی‌یەوەو هەڵگیرابوو، ئەوه سامانەکەی زیاد ئەکات، وه نوێژ بەسەر تابووتەوه له خەودا برایەتی و هاوڕێیەتی نوێیه.

١٣-**تـــاوان**: ئەگـەر خـەوت بینی کوژرایت ئاگاداربه له ناپاکی، وه تاوانت بەرامبەر کەسێکی تر نیشانەیه لەسەر کەوتنه ناو قەدەغه کراوێکەوه، وه دەڵێن گەیشتن به ئاواته.

١٤-**تـــاشـین**: تاشین بۆ ئافرەت له خەودا مێردەکەیەتی یان کوڕەکەی، وه بۆ سك پڕ له دایك بوونی کوڕەو بۆ کچیش دەزگیرانه.

١٥-**تـــا**: خـەو به تاوه مانای وایه تۆ کەسێك تاوانبار ئەکەیت یان کەسێك تاوانبارت ئەکات.

١٦-**تـرس**: هێمنی و ئارامی‌یه.

١٧-**تەخـتـه**: بینـینی تەخته به پا کراوی یان تەنکی نیشانەی ئەوەیه چەند کەسێك ناپاکیـت لەگەڵ دەکەن، وه بڕینی دارێك گیانی تیا نەبێ وه سێبەری نەبێ و بەری نەبێت وەك دوو روو وایـه بـه تـەواوی، ئەگـەر خەوت بینی دارێك دەشکێنیت ئەوه خەوێکی زۆر باشـه. ئاگاداری‌یـه بـۆ گۆڕانکاری‌یـەك بـەرەو ئاسـوودەیی‌یەکی بێ هاوتا.. وه ئەگەر له دوکانـێکی دارتاشیدا بوویت له خەودا و شتێکت دروست ئەکرد، ئەوه خەوێکی باشه، وه

ئەگەر لە خەودا بەناو دارستانێکدا دەڕۆیشتی و درەختەکان سەوزو گەشاوە بوون ئەوە خەوێکی باشە.

١٨-**ترسناك:** خەوی ترسناك نیشانەیە لەسەر هێمنی و ئاسایش.

١٩-**تەقە دان لە دەرگا:** نیشانەی ئاگاداری‌یە.

٢٠-**تاوان:** ئەوەی لە خەودا خۆی بە تاوانباری بینی‌یەوە ئەوە کۆمەڵێك دەبنە شوێن کەوتەی .

٢١-**تەسبیح:** تەسبیح لە خەودا رەمزە بۆ ئافرەتی چاك یان گوزەرانی حەڵاڵە بۆ کەسێ خاوەنی تەسبیحەکە بێ یان تەسبیحاتی پێ بکات، پۆشینی تەسبیح لە خەودا بەختێکی ئاسوودەیەو سەرکەوتوانەیە، وە تەسبیح کردن پێی بەرەکەت و رۆزی تازە پێگەیشتووە.

٢٢-**تیر:** تیر لە خەودا هەواڵێکە پێت نیشان ئەدا لەو رێگای پیایدا ئەڕۆیت، وە تیری زۆر لە خەودا مانای بوونی ناڕەحەتی‌یەکانە، ئەگەر تیرەکانت بۆ دواوە ئەگرت ئەوە ئەو ناڕەحەتیانە نامێنن، و ە تیری شکاو نیشانەیە بۆ نەمانی ناڕەحەتی یان وادەی نزیك بوونەوە کە ناڕەحەتیەکە نەمێنێت.

٢٣-**تێر بوون:** تێر بوون لە خەودا نیشانەیە بۆ موچە بە دەست هێنان و بەڵێنی سامانە.

٢٤-**تیشك:** بینینی تیشك لە خەودا نیشانەی خۆشی و کار ئاسانی‌یە، وە بۆ نەخۆشیش نیشانەی مردنە.

٢٥-**تارمایی مردن:** تارمایی مردن لە خەودا ئاگاداری‌یە لە چەند کارێك کە بەم زوانە روو دەدات.

٢٦-**تەم و مژی ناسایی:** تەم و مژی ئاسایی لە خەودا نیشانەی چاو راو کردنە لە کارێك یان فرمانێکدا.

٢٧-**تەم و مژی چڕ:** تەم و مژی چڕ لە خەودا نیشانەی دووبەرەکی‌یە و کوشتن لە ناوانباندا روو دەدات.

**٢٨-تـەم و مـژی کـەم خایەن:** ئەو تەم و مژەی خەریکە ئەڕوا نیشانەیە بۆ سەرەتای رزگار بوون.

**٢٩-تـاعون:** تاعون لە خەودا جەنگە وەك چۆن جەنگ لە خەودا تاعونە.

**٣٠-تەشـت:** ئەگـەر تەشـتت بەکانەهێـنا لە خەودا مانای وایە ژنەکەت رێنومایيت ئەکات بۆ هۆکارەکانی پاکێتی و پیسی.

**٣١-تـەلاق:** ئەگەر لە خەودا تەلاقت خوارد و ژنیشت هەبوو ئەوە مانای ئەوەیە رازی نیت بە گوزەرانی ئێستات.

**٣٢-تـاریکی:** تـاریکی و تاریکایی لە خەودا رەمزە بۆ سەر لێ تێکچوون و مردن وە بۆ کوشتنی هیواو ئاوات و بۆ تێڕامان، ئەوەی لە تاریکاییەوە بەرەو رووناکی رۆشت ئەوە لـە هـەموو ناڕەحـەتی و ناخۆشییەك رزگاری دەبێت. ئەگەر خەوت بینی و لە شوێنێکی تـاریکدا بوویت، ئەوە نیشانەی ئەوەیە ناڕەحەتییەکە بەسەر ئەچێ، ئەگەر تیشکێکت لە دوورەوە بینی بە تايبەتی ئەگەر خۆتت بینی دوای ئەوە تاریکیەکەت بەجێ هێشت و بەرەو رۆشـنایی رۆیشـتی، وە ئەگـەر تاریکیـت بـینی و نەماو بەرە بەیان جێگای گرتەوە، ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی خۆش بە لە پشتی دەریاکانەوە.

**٣٣-ترێ:** لێکدانەوەی لە خەودا رۆزیی باش و بەردەوام و فراوانە، وە لە کاتی خۆیدا رۆزیـی دونیایە، وە ئەگەر لە وەرزی خۆیدا نەبوو بینیت چاکەیەکە بەر لە کاتی خۆی بە دەسـتت ئـەگات، ئـەوەی هێشـووە تـرێی لـێ کردەوە سامانێکی لە ئافرەتێکەوە دەست ئەکەوێـت. ئـەوەی بـینی تـرێ کـۆ ئەکاتـەوە بەلام لـێی ئەکەوێ یان ئەیەوێ بگات بە تـرێیەکەو ناتوانـێ نیشـانەی دۆڕاندن و ناڕەحەتییە. ترێی سپی لە خەودا چاکەو لەش سـاغییە، چـونکە حەزرەتی نوح ﷺ تووشی نەخۆشی دەردەباریکە (السل) بوو خوا پێی راگەیاند کە ترێ بخوا ئەویش وای کردوو لە نەخۆشیەکەی چاك بوویەوە، بەلام لێکدانەوەی ترێی رەش رۆزییەکی کاتییە.

**٣٤-تەمـەنی درێـژ:** ئەگـەر لە خەودا بینیت تەمـەنت درێژ بووە نیشانەی ئەوەیە لە کاتـێکی هاوچـەرخدا بـە کـارێك هەڵدەسـتیت و تووشـی دۆڕانـدن دەبیت، بەلام ئەگەر

هەوەکەت تایبەت بوو بە هاوڕێیەکتەوە مانای وایە لە کارێکی هاوبەشداو لەگەڵ هاوڕێکەتدا تووشی دۆڕاندن دەبیت.

**٣٥-تینوێتی:** تینوێتی لە خەودا بە مانای ناتەواوی ئاین یان رەوشت یان کارە چاکەکان یان سامان یان رەگەز دێت، وە بینینی جزگە نیشانەیە بۆ باشی ئاین و رازی بوون و رێکی و گوزەران باشی، وە دەڵێن تینوێتی نیشانەی نارەحەتی سامانە، ئەگەر تینوت بوو پاشان ئاوێکی پاکت خواردەوە یان هەر خواردنەوەیەکی بەتام ئەوە بە خێرایی نارەحەتییەکەت ئەڕوا، بەڵام ئەگەر تینوێتییەکەت وای لێ کردیت ئاوێکی پیس یان هەر خواردنەوەیەکی تام ناخۆش بخۆیتەوە، ئەوە خەوێکی باش نییە.

**٣٦-تورەیی:** تورەیی لە خەودا نیشانەی حەسرەت و بەوقومییە، ئەوەی لە خەودا تورە بوو لە پێناوی خوای گەورەدا ئەوە دەسەڵات و هێزی دەزگیر ئەبێ.

**٣٧-تەپ و تۆز:** تەپ و تۆز لە خەودا سامانە، چونکە لە خۆڵەو خۆڵیش سامانە، ئەوەی تەپ و تۆزی لە نێوان ئاسمان و زەویدا بینی ئەوە بە کارێکەوە تلاوەتەوە نازانێ چۆن رزگاری بێت لێی، ئەوەی بینی دەستی یان پۆشاکی ئەتەکێنێت لە تەپ و تۆز، ئەوە هەژار ئەبێت، وە دەڵێن تەمەنی درێژی دەبێت. تەپ و تۆز لەگەڵ رەشەباو هەورە گرمەو بروسکەو کەم بارانیدا مانای وایە نارەحەتییەك لەو شوێنەدا روو ئەدات.

**٣٨-تەور:** تەور لە خەودا نیشانەی ئاسایشە، هەندێ جار نیشانەی قازانجە یان ئاسایش، یان رەمزە بۆ رەگەزو جنسی نێرینە.

**٣٩-ترس:** ترس لە خەودا نیشانەی کردنی ناهەقییەکە، مردن لە تاو ترس نیشانەی مردنە بە هەژاریی، دەڵێن ترس لە خەودا ئاسایش و خۆش بەختییە، مردن لەتاو ترس نیشانەیە لەسەر هەژاریی و نەداری.

**٤٠-تیپی مۆسیقا:** گوێ گرتن لە ئاوازی مۆسیقا لە خەودا دوو جۆرە، ئەگەر گۆرانییەکان خۆش بوون نیشانەیە بۆ بەختەوەرییەکی چاوەڕوانکراو، وە ئەگەر گۆرانییەکان غەمگین بوون نیشانەی مردنی یەکێکە لە ئەندامانی خێزانەکەت.

٤١-**تەشوێ**: تەشوێ لە خەودا نیشانەی ئافرەتی زمان درێژە، وە دەڵێن ئەوە پیاوێکی چاکە بۆ کەس و کارێکی لارو وێر.

٤٢-**تیرو کەوان**: خەوت بە پێکانی هەر دەست نیشانێك نیشانەی سەرکەوتنە، بەلام ئەگەر نیشانەکە نەپێکیت ئەوە لەو کارەدا کە پێی هەڵدەستیت دەدۆڕێیت.

٤٣-**تۆپ**: خەو بینین بە تۆپەوە نیشانەی ئاژاوەیە، وە دەڵێن نیشانەی سەفەرە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، وە ئەڵێن هەر خەوێ پەیوەندی بە یاری تۆپەوە هەبێت نیشانەی ئەو کارانەیە کە پەیوەندی بە سامانەوە هەیە، ئەگەر تۆپێکیان بۆ هەڵدایت و گرتتەوە ئەوە بەختێکی باشە، بەلام ئەگەر نەتگرتەوەو کەوتە سەر زەوی و دوورکەوتەوە ئەوە گەشبینیەکە هێشتا هەر باشە، بەلام ئەو خێرەی تووشت ئەبن کەمن و دوا ئەکەوێ.

٤٤-**توورەکەی پارە**: توورەکەی پارە لە تەفسیردا نیشانەیە لەسەر خاوەنەکەی، ئەگەر پارەی پێ نەبێ ئەوەی نیشانەیە لەسەر مردنی، ئەگەر پارەی پێ بێت نیشانەی لەش ساغی‌یەتی، وە بە ئەندازەی زۆری و زیادی پارەکە لە کیسەکەدا لەش ساغی‌یەکەش زیاد ئەکات و پتەو ئەبێت، وە ئەڵێن توورەکەی پارە رەمزە بۆ نهێنی خاوەنەکەی، توورەکەی پارە بە گشتی نیشانەی ئەوەیە کە هەواڵی خۆش و چاوەڕوان نەکراو دەبیستیت، وە ئەگەر لە خەوەکەدا کیسە پارەکەت لێ ون بوو مانای هەرەس هێنانە، ئەگەر خانمێ یان کچێ وتی تورەکە پارەم دۆزیوەتەوە ئەوە هەواڵێکی خۆش لە دوورەوە ئەبیستیت، بەلام ئەگەر پێی وتی کە گومی کردووە ئەوە هەواڵەکە ناخۆش ئەبێت.

٤٥-**تانجی – سەگی راو**: بینینی تانجی یان سەگی راو نیشانەی سەرکەوتنە دوای هەوڵێکی زۆر.

٤٦-**تێکەلاو بوون (المجامعة)**: ئەوەی بینی لە خەودا تێکەڵی ئافرەتێ ئەبێت و ئەیناسێت ئەگەر جوان بێ و پۆشاك و خشڵی جوانی لەبەردا بێت نیشانەی خێرێکی زۆرە، وە ئەگەر ئافرەتەکە پیرو پۆشاك ناشیرین بوو نیشانەکەی بە پێچەوانەوەی ئەوی دیکەوەیە،

وە تێکەڵی ئافرەتی نەناسراو باشە بە رادەی حاڵی ئافرەتەکەو رووخسارو شێوەی، ئەوەی بینی تێکەڵی ژنی پیاوێ ئەبێ کە ئەیناسێ نیشانەی ئەوەیە سوودێکی دەستگیر ئەبێ.

٤٧-**تەرازوو:** تەرازوو لە لێکدانەوەدا نیشانەیە لەسەر دادپەروەری دادگەر، وە رێك وەستانی تەرازوو مانای دادپەروەریی دادگەرە، وە مەیلانی بە لای راستدا مانای مەیلانێتی بە لای خاوەن هەقدا، وە مەیلانی بە لای چەپدا ئەوە مەیلانی دادگەرە بەلای ناهەقیدا، وە لار وەستانی نیشانەی زوڵمی دادگەرە، ئەگەر پارەت لەسەر لایەکی تەرازووەکە بینی ئەوە نیشانەیە لەسەر قسەو تێکچوونی خەڵکی.

٤٨-**تونێل:** خەو بینین بە تونێلەوە یان پەڕینەوە پیایدا نیشانەی ناڕەحەتییەکە کۆتایی دێت، بە تایبەتی ئەگەر لە کۆتایی تونێلەکەوە بیت و خۆر بە گەشاوەیی ببینیت، ئەوە نیشانەیەکی زۆر چاکە، چونکە ئەوپەڕی ناڕەحەتیت ئەڕەوێتەوەو ئاسوودە ئەبیت لە دوا رۆژدا.

٤٩-**تاوڵە:** ئەگەر خەوت بینی یاریت بە تاوڵە ئەکردو ئەتبردەوە مانای وایە بەختێکی باش چاوەڕوانتە لە ئیش و کارو خۆشەویستیدا، وە ئەگەر تووڕە بوویت لە کاتی یارییەکەدا وە نەتئەبردەوە ئەوە چاوەڕوانیی دۆڕانێکی هێمنانە بە.

٥٠-**تەلەفۆن:** ئەوەی لە خەودا گوێی لە زەنگی تەلەفۆنەوە بوو فەرمان بوو یان رێ لێ گرتن یان ئاگاداری یان قسە وتن یان مژدە ئەوە ئەنجامەکانیش بە هەمان شێوازی بیستنەکەیە، وە هەروەها هەموو دەنگەکانیش هەر بەو شێوازەیە.

٥١-**تانك:** خەو بینین بە تانکەوە (مدفع) دژواریی و ناڕەحەتیی خێزانییە، یان هەواڵە لە سەربازێکەوە.

# ( ج )

**١-جۆلانــه:** خــەو بیــنین بە جۆلانەوە یان جۆلانە کردن بەلگەیە لەسەر دوو روویی و راڕایی، وە ئەلێن ئەوە دنیایەکی راڕاو گۆڕراوەو جێگیر نی‌یە لەسەر شێوازێك.

**٢-جۆگــه:** ئەگــەر لــە خەودا جۆگەت بینی و ئاوەکەی پاك بوو ئەوە خەوێکی چاکە، بەلام ئەگەر پڕ بێت لە قوڕاو یان رەشاو بێت ئەوە ئاگاداری‌یە.

**٣-جــێگیر بــوون:** جــێگیر بوون لە خەودا نیشانەیە لەسەر رۆزی و هێزی بازوو سوور بوون لەسەر ئیش و کار.

**٤-جوانــی:** جوانــی مــرۆڤ لــە خــەودا لە پۆشاك و روخساریدا نیشانەی خراپی حالی دوژمــنەکەیەتی، وە هــەموو خــەوێکی تایــبەت بــە جوانی‌یــەوە باشــەو چــاکە، ئەگــەر ئافرەتــێکی جوانــت بینی یان منداڵێکی جوان یان دیمەنێکی جوان و سەرنج راکێش ئەوە بەڵێنی سەرکەوتنن، وە هەرکاتێ جوانی‌یەکە زیاد بکات سەرکەوتنەکەش زیاد ئەکات.

**٥-جۆکــی:** جۆکــی لە خەودا ئەگەر بە ئەسپەکەی توند ئەڕۆیشت ئەوە ئاشکراکردنی جووت بوونە (زواج).

**٦-جەنگ:** جەنگ لە خەودا تێکچوون و ناڕەحەتی و خەتەرناکی‌یە یان ناکۆکی‌یە یان نیشــانەی بــەرز بوونــەوەی نــرخە، وە بینــینی ســەرباز نیشــانەیە لەســەر ناڕەحــەتی، وە تەقینەوەی مین نیشانەیە لەسەر دووبەرەکی نێوان پیاوو ژنەکەی، وە خەو بینین بە رۆیشتن بۆ جەنگ نیشانەیە بۆ هەوالی خۆش.

**٧ جـووت بوونـی نزیك:** خەو بە جووت بوونی نزیکەوە مانای تێگەیشتن و گونجان و ڕ ڕەوتنە لە زۆر کاروباردا.

**٨ جووت بوون، ژن هێنان:** جووت بوون بە پەردە پلەو پایە یان نرخ و ڕێزەو بێ پەردە لێشبکی نوێیە، وە بەستنی پەیمان لە خەودا مانای عەقدو پەیمانە لەگەڵ خوای گەورەدا، ئەگەر ئافرەتێکی ناسراوت خواست نیشانەیە بۆ سەرکەوتن، وە ئەگەر ئافرەتێکی نەناسراوت خواست، ئەگەر کچ بوو ئەوە دونیایە، ئەگەر بێوەژن بوو ئەوە ساڵە، وە ئەگەر ئافرەتەکە جوان و قەڵەو بوو ئەوە ساڵێکی بە پیتە، وە ئەگەر ناشیرین و لاواز بوو ئەوە ساڵێکی قاتییە.

**٩-جـێگەو بـان:** جـێگەو بان لە خەودا نیشانەیە لەسەر هەموو شتێ کە مرۆڤ دڵی پـێی خـۆش ئـەبێ، بۆ عازەب هاوسەرە ئەگەر دانیشێ لەسەری، وە بۆ پیاو ژنێکی گوێ ڕایەڵی بـە وەفایـە، ئەگـەر شوێنی جێگاکە پیس و چڵکن بێت، بۆ نەخۆش مردنیەتی، لـەوەی جـێگاکەی شـکا یـان کـرایەوە لـە خەودا ئەوە کارەکەی ئەڕەوێتەوەو ئەو چاکەی هەیـەتی ئـەڕوا، وەکو لابردنی لەسەر ئیشەکەی یان جیابوونەوەی لە ژنەکەی بە تەڵاقدان یان مردن یان بەجێ هێشتن یان گەشت، وە ئەڵێن ئەگەر جێگەوبان نارێك و پیێك بوو یان هەساوە نەبوو ئەوە ئاگادارییە لە نەخۆشییەکی نزیك، بەڵام ئەگەر سپی و خاوێن و ڕێك و پیێك بوو ئەوە مانای گۆڕانێکی نزیکە لە کارو ماڵەوەدا.

**١٠-جـۆ:** بینـینی جۆ لە خەودا خێرو ڕۆزی و سامانە لەگەڵ لەش ساغیدا بۆ کەسێ هەیبێـت یـان بـیخوات، وە دروێـنە کـردنی جـۆ لە کاتی خۆیدا سامانێکە پێی ئەگا، بێجگە لە کاتی خۆی باش نییە، وە چاندنی جۆ لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئیشی چاکەی نو، وە کڕینی جۆ لە خاوەن عەلەف تووش بوونی خێرێکی گەورەیە، وە ڕۆشتن بە کێڵگەی جۆدا نیشانەی تێکۆشانە.

**١١-جەژنی لە دایك بوون:** خەو بینین بە جەژنی لە دایك بوونەوە باش نییە.

**١٢-جـێگا:** جـێگا لـە خەودا نیشانەیە لەسەر ژن، فراوانیی جێگا نیشانەی فروانیی هوورەفتاریەتی، جـێگای نـوێ نیشـانەیە لەسـەر ژنـی جوان، جێگای کۆنیش نیشانەیە

لەسەر وشکی، جێگای دڕاویش نیشانەیە لەسەر ژنێکی بێ تایین، وە سافیی شوێن نیشانەی گوێ ڕایەڵیی ژنە بۆ مێردەکەی، وە پەیوەست بوونە پێی، ئەگەر جێگاکە خوری یان لۆکە بوو نیشانەی دەوڵەمەندی ژنەکەیە، وە ئەگەر جێگاکە سپی بوو نیشانەی ئەوەیە ژنەکە خاوەن ئایینە. وە ئەگەر سەوز بوو مانای وایە (اجتهاد) کەرە لە خواپەرستیدا، وە ئەگەر جێگاکە ڕەش بوو ئەوە ئافرەتێکی ماندوو شازە، ئەوەی بینی کەسێکی تر پێخەفەکەی ئەدڕێنێ ئەوە ناپاکی لەگەڵ دۆستەکانیدا ئەکات، ئەوەی لە خەوا پێخەفەکەی گۆڕی بە پێخەفێکی تر ئەوە ژنەکەی ئەگۆڕێ بە ژنێکی تر. وە هەروەها ئەگەر بینی نوێنەکەی گۆڕا بۆ حاڵەتێك کە پێی ڕازی نەئەبوو، ئەوە ژنەکەی ئەمرێ یان تەڵاق ئەدرێ، ئەگەر نوێنێکی نامۆی بینی یان زانراو بوو، بەڵام لەسەر ڕایەخێکی نامۆ بوو ئەمیش دانیشتبوو لەسەری ئەوە ئەبێ بە دەسەڵاتدارێ کە لە پیاوانی تر گەورەتر ئەبێ.

**١٣-جلی بوکێنی:** خەو بە جلی بوکێنییەوە (جلی سپی درێژ، تارای سپی) نیشانەی ڕوودانی ڕووداوێکی ئاسوودەیە.

**١٤-جام، کاس:** ئەگەر لە خەودا بینیت بووی بە خاوەنی کاسێکی جوانی خاوێن یان ئاوت تیا ئەخواردەوە یان شلەیەکی بە تامی خاوێن، نیشانەی ئەوەیە ڕۆزییەکی چاکی فراوانت بۆیەت، بەڵام ئەگەر کاسەکە شکاو بوو یان پیس بوو یان شلەیەکی پیسی تێدا بوو ئەوە نیشانەیەکی خراپە.

**١٥-جووجەڵە، جوچکە:** ئەگەر لە خەودا جوجەڵەکان زۆر بوون و ئەهاتن و ئەچوون ئەوە نیشانەی ناڕەحەتی بچووکە، بەڵام ئەگەر جوچکەکان گەورە بوون و بەهێز بوون ئەوە بەڵێنە بە بەختێکی باش لە کاروباردا بە تایبەتی ئەگەر جووچکەکان بخورێن.

**١٦-جەنگ، شەڕ:** ئەگەر خەوت بینی شەڕت ئەکردو شەڕەکەت بردەوە ئەوە نیشانەی سەرکەوتنە، بەڵام ئەگەر لە شەڕەکەدا دۆڕایت مانای وایە ناڕەحەتیەکت تووش ئەبێ بە پێچەوانەی ئەوەی ئێستا پێیەوە خەریکیت.

**١٧-جێگری شەرعی (الوكيل الشرعي):** چاوپێکەوتنی یەکێکیان لە خەودا نیشانەی هەواڵی خراپە، وە قسە کردن لەگەڵ یەکێکیاندا نیشانەی زیانێکی ماددییە.

# ( چ )

١-**چوونه ناو قوڕ:** خەوی چوونە ناو قوڕ نیشانەی لە پاش ملە قسە کردنە.

٢-**چەپکە گوڵ:** ئەگەر چەپکێ گوڵیان دایتێ لە خەودا ئەوە نیشانەیە لەسەر چاکەو گەشبینی باش، وە ئەگەر خۆت بینییەوە لەناو گوڵداو دڵخۆش بوویت ئەوە نیشانەیە لەسەر پەیوەندی سۆزیی ناڕەحەت، وە ئەگەر گوڵت کۆ دەکردەوە ئەوە ئاواتی جوانت هەیە لەوانەیە سەرکەویت.

٣-**چەپڵە :** چەپڵە لە خەودا نیشانەی خۆشی و ئاسوودەیە.

٤-**چنین:** ئەگەر لە خەودا قوماشێکت ئەچنی، یان یەکێکی تر ئەیچنی ئەوە لە کاری خۆشەویستی‌یەکەتدا بەختەوەر ئەبیت یان لە کارەکەتدا سەرئەکەوی، وە ئەگەر سەیری چنینت کردو سەرت پێی سوڕئەما، ئەوە چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش بە، وە ئەگەر چنینەکە پچڕاو بوو یان ناشیرین بوو ئەوە بەختێکی چاکە، هەرچەندە پێش هەواڵی خۆش هەندێ ناخۆشی و هەرەس روو ئەدات.

٥-**چاڵ:** ئەوەی لە خەودا بینی زەوی‌یەك هەڵئەکەنێ ئەوە تووشی سامانێ ئەبی بە رادەی هەڵکەندنەکە، وە بە رادەی ئەو خۆڵەی دەری ئەدات.

٦-**چادر، دەوار:** دەوار لە خەودا سەرۆکایەتی‌یە بۆ بازرگانیش سەفەرە، وە ئەڵێن بۆ عازەب نیشانەی ژن هێنانی کچێکی جوانە، وە بۆ خاوەن هاوسەر حەسانەوەو خۆشی‌یە.

٧-**چەناگە**: چەناگە لە خەودا نیشانەیە بۆ سەرۆك خێزان و گەورەکەیان، ئەوەی بینی ریشی چەناگەی درێژ بووە زۆر بلێ دەرئەچێ و قسە لەسەر شتێك ئەکات پەیوەندی بەوەوە نییە، وە ئەلێن نیشانەیە لەسەر راکردنی خاوەنەکەی و خۆ شاردنەوە لە کۆمەڵ.

٨-**چەقۆ**: چەقۆ لە خەودا نیشانەیە لەسەر ژن، ئەوەی خۆی بینی چەقۆی بە دەستەوەیە ژن ئەهێنێ ئەگەر عازەب بێت، وە ئەگەر هاوسەری ببێ و ژنەکەی سکی پڕ بێت ئەوە منداڵەکەی سەلامەت ئەبێت، ئەگەر خەوت بینی چەقۆی میوەت بە دەستەوەیەو بە کاری ناهێنیت ئەوە کوڕێکی چاك و باشت ئەبێ، ئەگەر بەکارت ئەهێنا ئەوە نیشانەیە لەسەر پچڕانی ئەو کارەی پێیەوە خەریکیت، وە چەقۆی ئاسن لە دەستی پیاودا مانای گەڕانەوەیەتی بە ژنەکەیدا، وە بینینی چەقۆی زۆر لە خەودا نیشانەی لەسەر دزەران و کێشەو تێکچوون وە نیشانەیە لەسە ر دزسیە، وە ئەگەر چەقۆیەکت بە کەسێکی تر ئەدا، مانای وایە قسە یان شتێکت کردووە کە زیانی بۆ کەسێکی تر تێدایە، وە ئەلێن چەقۆ لە خەودا رەمزە بۆ دادوەر، چونکە دادوەر چەقۆیە بۆ بەندکراو.

٩-**چەك**: هەموو جۆرەکانی چەك لە خەودا نیشانەیە لەسەر هێزو سەرکەوتن بە پێی جۆری چەك و پلەکەی.

١٠-**چایی**: چایی لە خەودا نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی، ئەوەی خۆی بینی چایی بۆ خۆی ئامادە ئەکات نیشانەی رێکخستنی پیلانێکە بۆ کەسێکی تر کە دژی ئەم هەڵئەگەڕێتەوە، وە گەڵای چایی لە فنجاندا نیشانەیە لەسەر پارە، وە رشتنی چایی لە فنجانەکەتدا لە کاتی خەودا نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی لە ژیانی هاوسەرێتیدا.

١١-**چنراو**: خەو بە کڕین یان فرۆشتنی چنراوێکەوە نیشانەی سەرکەوتنە لە کاردا، وە هەروەها ئەگەر چنراوێك بدەیت بە کەسێکی تر، ئەگەر کەسێکت بینی چنراوی لەبەر ئەکرد ئەوە هەواڵی خۆش ئەبیستی، بەڵام ئەگەر خەوت بینی چنراوت لەبەر ئەکرد ئەوە پێشنیاری جووت بوونت پێشکەش ئەکرێ، یان پێشنیاری کارێکی نوێت پێشکەش ئەکرێ، وە سەرکەوتنێکی گەورەی تیا بە دەست ئەهێنی، وە ئەگەر خەوت بینی کە چنراوێکی پیست لەبەر ئەکرد، ئەوە چاوەڕوانی دزڕانێك ببە کە خۆت هۆی ئەو دزڕانەیت.

**١٢-چەپەڵۆك:** چەپەڵۆكی ئافرەت لە خەودا لەسەر دەم و چاوی نیشانەیە لەسەر مژدە دان بە منداڵی نێر دوای بێ تاقەتی، ئەوەی بینی چەپەڵۆكی كێشا بە مرۆڤێكدا ، یان كەسێك چەپەڵۆكێكی پیادا كێشا ئەوە لە بێ ئاگایی ئاگاداری ئەكاتەوە.

**١٣-چەكوش:** چەكوش لە خەودا رەمزە بۆ سەرۆك و دادگەرو ئەفسەری پۆلیس.

**١٤-چنین:** خەوت بە چنینی خوری‌یەكی رەنگینەوە، یان هەر خوری‌یەك كە رەنگی ئەشەنگی هەبێ مانای وایە تۆ زۆر ئاسوودە ئەبی بە هۆیەكی زۆر ئاسان.



**١-حوشتر:** حوشتر لە خەودا نیشانەی گەشتە، وە ئەلێن نیشانەی هێزە، وە دەلێن نیشانەی ئارامی‌یە، وە دەلێن نیشانەی ماتەمی‌یە، وە هەندێ جار حوشتر نیشانەیە لەسەر پیاوێکی عەرەبی کەتە، حوشتری مێ لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئافرەت، ئەگەر خەو بینەکە هەرزەکار بێت، ئەگەر هاوسەری عەبوو ئەوە زەوی‌یە یان خانووە، ئەوەی بینی سواری ئەبێ و حوشترەکەش هێمنە ئەوە حەج دەبێتە نسیبی، ئەگەر هەلشاخا پیایدا ئەوە ناخۆشی و نەخۆشی تووش ئەبێ، ئەوەی بینی زۆرانبازی حوشترێ ئەکات، ئەوە شەڕ لەگەڵ دوژمن ئەکات، ئەوەی بینی خاوەنی حوشترێکی زۆرەو رەویان پێ ئەکات یان خاوەنیەتی ئەوە دەبێتە سەرداری گەلێك.

**٢-حەج:** حەج لە خەودا رادەی ئاین و راست بوونەوەو خێرو ئاسایشە، وە دەرچوون بۆ حەج لە کاتی حەجدا نیشانەیە لەسەر دەسەلات بۆ کەسێکی لابراو، وە ئاسایشە بۆ حەج کەران وە قازانجە بۆ بازرگان و چاك بوونەوەیە بۆ نەخۆش و دانەوەی قەرزە بۆ قەرزار، ئەوەی بینی عەمرەی کردووە، ئەوە ژیانێکی درێژ بەسەر ئەبات.

**٣-حەسیر:** حەسیر لە خەودا نیشانەی حەوانەوەیە لە دنیادا وە راخستنی حەسیر راخستنی دنیایە، وە فراوانی فراوانی رۆزی‌یەو تەسکیشی تەسکی رۆزی‌یە، وە بچووکی حەسیر کەمی ژیان و کەمی تەمەنە، وە پێچانەوەی نیشانەیە لەسەر رۆزی و تەمەن.

**٤-حەسانەوە:** حەسانەوە لە خەودا دوای ماندوو بوون نیشانەیە لەسەر دەوڵەمەندی دوای هەژاری، و: نیشانەیە لەسەر ژنی چاك، ئەگەر خەو بینەکە نەخۆش بوو ئەوە مردنی نزیکە.

**٥-حیلەی ئەسپ:** بیستنی حیلەی ئەسپ لە خەودا نیشانەی ئەوەیە تۆ هاوڕێیەکی نوێت دەستگیر ئەبێ.

**٦-حەیزەران ( دارێکە بۆ لێدانی تۆپ بەکاردێت ):** یاری بە حەیزەران لە خەودا نیشانەی پشت بەستنە بە پیاوێکی دوو ڕوو.

# ( خ )

**١-خوای گەورە:** بینینی خوای گەورە لە خەودا دەگۆڕێت بە جیاوازی بینەرەکە، ئەوەی خوای گەورەی بینی بە گەورەیی و شکۆداری بە بێ یارمەتی دەرێك و لە یەك چوونێك و لاسایی کردنەوەیەك، ئەوە بەڵگەیە لەسەر چاکەو مژدەیە پێی لە دنیاداو سەلامەتی تایبەتیەکەیەتی لە دوا ڕۆژدا، ئەوەشی بە پێچەوانەی ئەمەوە خوای بینی، ئەوە بینینەکەی بەڵگەیە لەسەر ناخۆشی ژیان، ئەوەی بینی لە نەخۆش مردووە چونکە ئەو ڕاستە مردنیش ڕاستە، وە ئەگەر گومڕایەك بینی هیدایەت ئەدرێ، وە ئەگەر زۆر لێکراوێك بینی سەرئەکەوێ بەسەر دوژمنەکانیدا، وە ئەوەی خوای بینی لە وێنەیەکدا وەسفی بکات و دیاری بکات ئەوە بینینەکەی بە ووڕاوە دادەنرێ، چونکە خوای گەورە دیاری ناکرێ و وەسفیش ناکرێ، لە شێوەی ئەودا هیچ کەسێك نییە ﴿لیس کمثل شئ﴾ ئەو بیسەردو بینەرە ﴿وهو السمیع البصیر﴾.

**٢-خواردن:** ئەوەی لە خەودا بینی شت ئەخوات یان کەسێکی تر شت ئەخوات لەگەڵیدا ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئارەزووی مرۆڤەکە بۆ سوود وەرگرتن لێی، وە دەڵێن خواردن لە خەودا تێکەڵچوونە لەگەڵ کەسێکی ناریزدا یان بەڵگەیە لەسەر ناتەبایی، نە نێوانی ئەوانەی کە نان ئەخۆن لە گەڵیدا یان زیان پێکەوتنە لە ئیشدا، بە تایبەتی ئەگەر خواردنەکە شتێکی سوێر بێت، وە ئەگەر خواردنەکە سێو بوو، ئەوە جەنگێکی قورس چاوەڕوانی ئەکات، بەڵام خواردنی پەنیر مانای وایە ناخۆشیەکان ئاسان و سووکن، وە ئەگەر خواردنت بۆ دانراو لێت خوارد بە دڵی خۆت ئەوە ناخۆشیەکانت کەم دەبنەردو

بە زوویی ئەڕۆن، ئەگەر بانگ کرایت بۆ خواردنی نیوەڕۆ ئەوە بەڵگەیە بۆ سەفەرکردن، وە ئەگەر بانگ کرایت بۆ خواردنی ئێوارە ئەوە تۆ پیاوێك ئەخەڵەتێنی و باری ئەکەی پێش ئەوەی ئەو بارت بکات، وە ئەگەر بانگ کرایت بۆ خواردنێك بێجگە لەو کاتانە ئەوە ئەحەسێیتەوە لە ناڕەحەتی‌یەك، وە ئەگەر خەوت بینی برسیتە ئەوە چاکەت تووش ئەبێ و سوش سووریت لەسەر کردنی، وە ئەگەر تێر بوویت ئەوە بەڵگەیە لەسەر گەڕاندنەوەی ماڵێك بۆت.

خواردن لە خەودا خۆراکی گیانی‌یە لە ئاییندا وە ناڕەحەتی‌یە لە دنیادا، وە خواردنی سپی خێرە بۆ کەسێك کە بیخوات،وە ئەگەر زەرد بوو ئەوە نەخۆشی‌یە، وە خواردەمەنی ناهەنگ مژدەیە، وە خواردنی ماتەمەینی و تەعزیە خەم و خەفەتە، وە ئەو خواردنەی پەیوەندی نی‌یە بە کاتەکانەوە ئەوە رۆزی و سوودو نوێ بوونەوەی پلەو پایەیە بۆ کەسێ لێی بخوات.

٣-**خۆ کوشتن:** خۆکوشتن لە خەودا، بەڵگەیە لەسەر بوونی ئاژاوەو ناخۆشیی توندو دڵ ئەزێن.

٤-**خواستن:** ئەوەی لە خەودا بینی کە شتێك داوا دەکات یان ئەیخوازێ، ئەگەر ئەو شتەی خۆشەویست بوو ئەوە تووشی چاکەیەکی کەم خایەن ئەبێ، وە ئەگەر ناشیرین بوو ئەوە تووشی ناخۆشی‌یەکی کەم خایەن ئەبێ، چونکە داوا کردن شتێکی درێژ خایەن نی‌یە.

٥-**خانوو:** خانوو لە خەودا ژنی پیاوە، وە هەندێ جار نیشانەی لەسەر لاشەی پیاوەکە، ئەگەر ماڵەکە ساغ بوو ئەوە لاشەیشی ساغە، مەبەست لاشەی پیاوەکەیە، وە ئەگەر لار بوو ئەوە لاشەیشی وایە، ئەوەی لە خەودا بینی چووەتە سەر ماڵێکی نەناس ئەوە ئافرەتێکی پێکاوە بە قەدەر ئەو ماڵە، ماڵی تاریکیش ئافرەتی رەوشت خراپە، وە ئەگەر ئافرەت بینی ئەوە پیاوەکەی وەهایە، وە خانووی نادیار لە خەودا نیشانەی گۆڕە.

٦-**خەندە:** خەندە لە خەودا نیشانەی دڵخۆشی و ئاسوودەیی‌یە.

**٧-خورما:** خورما له خەودا بۆ کەسێ ببینێ بارانە، وە بۆ کەسێ بیخوات ڕۆزی‌یە وە خورمای هەڵگیراو ماڵی هەڵگیراوە.

**٨-خۆڵ:** بینینی خۆڵ یان ڕۆشتن بەناو خۆڵدا، یان هەڵگرتنی هەندێ لەو خۆڵە مانای ئەوەیە سامانێکت پێ ئەگا، بەڵام ئەگەر خەوت بینی ماڵەکەت پاك ئەکردەوە لە خۆڵ یان ڕەشەبای خۆڵاویت ئەبینی ئەوە نیشانەی سەرهەڵدانی دوڕاندنە.

**٩-خۆ بە زل زانین:** خۆ بە زل زانین لە خەودا نیشانەیە لەسەر ڕۆزی و پلەو پایەو بەڵاو کۆتایی‌یەکەی خراپە.

**١٠-خۆشەویستی:** خۆشەویستی لە خەودا نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی و خەفەت لە ناگاداریدا، بۆ نەخۆش هەژاری و مردنە، بۆ بێجگە لە نەخۆش ناڕەحەتی و کەم دەرامەتی‌یە، وە دەڵێن ئەگەر خەوت بینی کەسێکی دیاری کراو تۆی خۆش ئەوێ، ئەوەی نیشانەیە ئەوەیە تۆ خەریکە بە تایبەتی ئەوت خۆش ئەوێ.

**١١-خەنە تێگرتن:** خەنە تێگرتن بۆ ئافرەت لە خەودا ڕازاندنەوەی جوانی‌یە، وە بۆ پیاو فێڵ و ڕاکردنە.

**١٢-خەنجەر:** خەنجەر لە خەودا بەڵگەیەو سوودە لە دنیادا کە هەڵگرەکەی تووش دێت یان برایەك لەگەڵی‌دا ئەبێ یان هاوڕێ‌یە ڕاستگۆ ئەبێ لەگەڵی یان خزمەتکارێ خزمەتی ئەکات. وە کەسێ ببینێ نیشانەی ئەوەیە ئەچێتە ناو جەنگێکی ڕاستەقینەوە، ئەوەی بە دەستیەوە بێت نیشانەی ئەوەیە پێی سەرئەکەوێ، ئەگەر خەنجەرەکە بە کەسێکی تر بوو ئەوە دوژمن سەرئەکەوێ بەسەرتا.

**١٣-خشڵ:** پۆشین خشڵ زیویان ئاڵتوون لە خەودا نیشانەیە لەسەر ترس، وە خشڵی پیاو پەیوەندەکەیەتی، وە دەڵێن خشڵ نیشانەیە لەسەر جووت بوون.

**١٤-خەیار:** خواردنی خەیار لە خەودا مانای گەیشتنە مەبەستە لە فرمانێکی گەورەدا، بە تایبەتی ئەگەر خەیارەکە زەرد بێ، وە بۆ کەسێ ژنەکەی سك پڕ بێت ئەوە کچی ئەبێت، وە خەیار لە کاتی خۆی‌دا ڕۆزی‌یەو بێجگە لە کاتی خۆیشیدا نەخۆشی‌یە.

١٥-**خەرتەڵـە :** خەرتەڵـە لـە خەودا بۆ کەسێ بیخوات نیشانەی ئەوەیە ژەهر خوارد ەبێ یان دەکەوێتە ناو کێشەیەکی پیسەوە.

١٦-**خوێـن :** دەرچوونی خوێنی سوور لە لاشەت لە خەودا نیشانەی دەرچوونی سامانە لـە دەستت. وە دەڵێن لەش ساغی‌یە بۆ لاشەت و زیاد بوونی رۆزی و گوزەرانتە، وە رژانی خوێنی پیس لە لاشەت چاك بوونەوەیە لە نەخۆشی.

١٧-**خانەی نادیار:** خانووی نائاشکرا لە خەودا رۆژی دوایی‌یە.

١٨-**خانەی دیار:** خانووی ئاشکرا لە خەودا دنیایە بە قەد ئەندازەی حاڵی دنیا.

١٩-**خۆڵەمێش:** بینینی خۆڵەمێش لە خەودا نیشانەیە لەسەر کرداری خراپ.

٢٠-**خشـۆکەکان :** خشـۆکەکان وەکـو کیسـەڵ و تیمسـاح و مارو تولە مار لە خەودا هەمووی نیشانەیە لەسەر دووبەرەکی و دوژمنایەتی.

٢١-**خـەیاڵاوی:** خـەیاڵاوی لە خەودا مانای ئەوەیە کەوا چەند بیرکردنەوەو ناخۆشی و غەمت هەیە ئێستا جەنجاڵی کردوویت.

٢٢- **خـۆر:** خـۆری گەشاوە لە خەودا نیشانەی ئەوەیە بەختیاریت لێوە نزیکە، بینینی خـۆری هـەڵهاتوو لـە خـەودا نیشـانەی ئەوەیـە هاورێکەت دڵپاکە بۆ تۆ، بینینی خۆری روونـاکی دەر لـە خـەودا نیشانەیە بۆ سەرکەوتن و دەرچوون، بینینی خۆری داپۆشراو لە خـەودا نیشانەیە لەسەر بوونی رێگرەکان، خۆری سوور لە خەودا نیشانەیە لەسەر جەنگ بـان فـێڵ، بینـینی خـۆری ئاوا بوو لە خەودا ئاگاداری‌یە بۆ ئەو کەسەی کە بە دڵپاکت داناوە، خۆری ئاسایی لە خەودا رەمزە بۆ یەکێ لە باوك و دایك یان بۆ دادگەر، وە بینینی هەڵهاتنی خۆر لە ماڵەکەتدا نیشانەی جووت بوونە ئەگەر عازەب بیت، وە نیشانەی پلەو پایـە بـە دەسـت هێـنان و زیـاد بوونە لە رۆزیدا ئەگەر هاوسەرت هەبێ. ئەگەر ئافرەت خـۆری بـینی لـە ماڵـەوە یـان هەڵهاتبوو، ئەگەر مێردەکەی بازرگان بوو قازانج ئەکات تیایدا، وە ئـاوا بوونـی خۆر لە خۆر ئاوابە بە شێوە ئاسایی‌یەکەی وەکو هەڵهاتنیەتی لە مانـای خەوەکـەدا، وە دانیشـتن لەبەردەم خۆردا بە دەست هاتنی رۆزی و بەرەکەتە، ئەوەی خۆری بینی لە خۆرئاواوە هەڵئەهات یان لە خۆرهەڵاتەوە ئاوا ئەبوو ئەوە نیشانەیە لەسەر

چاوەڕوانی ڕووداوێکی نائاسایی و ئاشکرا بوونی شتێکی نادیار، ئەگەر نەخۆش بێت چاك ئەبێتەوە.

**٢٣-خواردنـــەوە:** خواردنـــەوە لـــە خـــەودا بـــە هـــەموو جۆرەکانی‌یـــەوە، هـــەموو خواردنەوەیـەکی ڕەنـگ زەردو نیشـانەیە لەسـەر نەخۆشی، بەڵام خواردنەوەی وەنەوشەیی نیشـانەیە بـۆ چـاك بوونـەوە، وە خواردنەوەی هەنگوین و سێو و ئاو خواردنەوانەی تام و چێژیان هەیـە بۆ دەوڵەمەندان خێرەو بۆ هەژاران خراپ و پیسە، خواردنەوەی ماستاو لە خـەودا نیشـانەیە لەسـەر زانسـت و دەروازە، وە خواردنەوەی ئاو نیشانەیە لەسەر تەمەن درێژیی، وە خواردنـەوەی گـیراوە نیشـانەیە لەسـەر نەمانی نەخۆشی ئەگەر خەو بینەکە نـەخۆش بێـت، وە نیشـانەی نەخۆشـی‌یە ئەگـەر لـەش سـاغ بێـت. وە خواردنەوەی شتی سروشـتی نیشانەیە بۆ ڕێز، وە دەرمانی سەر ئێشە لە خەودا نیشانەیە بۆ چارەسەرکردنی نـاکۆکی دوژمـنان، وە هەروەها خواردنەوە ساردو سەهۆڵی‌یەکانیش. ئەوەی لە ئاوی دەریا بخواتـەوە دەسـەڵات بـە دەسـت ئەهێـنێ بە ئەندازەی خواردنەوەکەی، یان ژیانێکی خۆش ئەگـەر ئـاوی دەریاکـە ڕوون بێـت، بـەڵام ئەگـەر ئاوەکەی لێڵ بوو، ئەوە تووشی ترس و ناڕەحەتی و غەم دەبێت.

**٢٤-خێر، چاکە:** خێر لە خەودا نیشانەیە لەسەر ڕاستگۆیی لە قسەدا و ڕاستگۆیی لـە خـەودا. ئەگـەر خـێرێکی چـاکت کـرد لـە خـەودا ئـەوە بەرەکەت دەخرێتە هەموو شتێکتەوە.

**٢٥-خـوری:** ئـەوەی لـە خـەودا خووری لەبەر ئەکرد ئەوە سامانێکی کۆکراوەی زۆری دەسـت ئەکـەوێ ، ئەوەی لە خەودا بینی لەسەر خووری نوستووە ئەوە سامانێکی گەورەی چـنگ ئەکـەوێ لـە لایـەن ژنەکەیـەوە، وە سـووتاندنی خووری لە خەودا داوێن پیسی و نـەمانی سـامانە، خەو بە کڕین یان فرۆشتنی خوری‌یەوە هەر جۆرێ بێت یان هەر ڕەنگێ نیشانەی سەرکەوتنە لە ئیشدا وە بینینی چوار پێ‌یەك بە خوری‌یەوە نیشانەی سەرکەوتنە کە پەیوەندی بە هاوڕێیەکتەوە هەیە.

٢٦-**خاچ:** خاچ له خەودا گەشبینی باشەو نیشانەی هیواو نەمانی هەموو نارەحەتی‌یەکە.

٢٧-**خواردن:** خواردن لەخەودا بە مانای خواردنی مەعنەوی دێت له خواوە وە له نیشتماندا وە له هەق و شەرەفدا.

٢٨-**خنکان، نوقم بوون:** خنکان له ئاوی پاك و دەریای ئارام له خەودا مانای نوقم بوونە لە خۆشی دونیادا، وە لەسەر فیتنەی دین و دنیا، وە نوقم بوون له ئاوی لیّل و شەپۆلاوی نیشانەیە لەسەر نارەحەتیەکی رووخێنەر کە تووشی دەبێت، نوقم بوونی نەخۆش له دەریادا نیشانەیە لەسەر مردنی.

٢٩-**خەڵووز:** خەڵووزی گڕدار له خەودا نیشانەیە لەسەر بەختەوەری و سەرکەوتن.. خەڵووزی خۆڵەمێش نیشانەی ماتەمینی و وەفایە.

٣٠-**خوێندنەوە:** ئەگەر خەوت بینی ئەخوێنیتەوە یان رازیت له خوێندنەوەکەت ئەوە چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش بکە، وە ئەگەر رازی نەبووی لەوەی ئەیخوێنیتەوە ئەوە هەواڵەکە ناخۆشە.. وە خوێندنەوەی قورئان لە خەودا یان خوێندنەوەی کەمێکی سەربەرزی و سەربلندی‌یە، ئەگەر خوێنەرەکە هەژار بێت خوا دەوڵەمەندی ئەکات، وە ئەگەر قەرزار بێت خوا قەرزەکەی بۆ دابین دەکات، وە ئەگەر سەرپێچی کەر بێت خوا لێی خۆش ئەبێت، وە خوێندنەوەی ئەو سوورەتانەی زۆرجار بەسەر مردوودا دەخوێنرێت نیشانەی مردنی نەخۆشەکەیە.

٣١-**خۆر گیران:** ئەگەر له خەودا بینیت خۆر له حاڵەتی گیراندایە، مانای وایە تۆ هاورێ‌یەکت له دەست ئەدەیت.

٣٢-**خواردنی میوەیەك له درەختێکی کۆن:** مانای دەست کەوتنی میراتە لە خزمێکی نزیکەوە.

٣٣-**خشڵ:** خەو بە خشڵەوە مانای بەختە، وە بەخشینی خشڵ له خەودا مانای هەستی راستەقینەو ئارەزووە لە جووت بوون، وە دەڵێن خەو بە خشڵەوە نیشانەیە لەسەر دەوڵەمەندی و سامان و بەختیاری وە ئەوەی بەختیاریت بۆ بەدی ئەهێنێ له ژیاندا.

**٣٤-خـوێ:** خەو بینین بە خوێوە نیشانەی رازی بوونە بە ژیانی رابردوو رازی نەبوون بە ژیـانی ئێسـتا، نیشـانەیە لەسـەر باشـی گـوزەران لە دوا رۆژدا.. وە خوێی سپی لە خوا ترسـانە لـە دنیادا، ئەوەی بینی بە خوێوە شتێکی خوارد ئەوە لە دنیادا بەشتێکی ئاسان دەساچـێنێت، ئەوەی لە خەودا خوێی بینی ئاسایشی لە ژیاندا دەستگیر ئەبێ.. ئەوەی لە خـەودا خوێی دەست کەوت تووشی ناڕەحەتی و نەخۆشی ئەبێت. وە ئەڵێن خەو بە خوێوە بەختـێکی ئاسـوودەی پێوەیە.. ئەگەر بە بێ ئومێدی بە دوای خوێدا گەڕایت یان گۆشت ئەخوێـت و بـە هـۆی نـەبوونی خوێوە زۆر ناڕەحەت ئەبیت لەم دوو حاڵەتەدا بریتی‌یە لە ئاگـادار کـردنەوە کـەوا ناڕەحەتی‌یـەك لـە کارەکەتدا بەدی ئەکەیت و ئەتوانی زاڵ بیت بەسەریدا، ئەگر چاك گوێی پێی بدەیت.

**٣٥-خـەوتن:** خـەوتن لـە خـەودا بـێ ئاگایی‌یـە، خـەوت بـە نووسـتنەوە نیشانەی ناڕەحەتی‌یـە لـە ئەنجامی پشتگوێی، یان نەخۆشی‌یەوە، ئەگەر کەسێکت بینی خەوتبوو یـان نـەخۆش بـوو، ئاگاداری‌یـە لـە هـەواڵی نـاخۆش.. خـەوتن لەسـر سـك لـە خەودا دەسـتکەوتنی زەوی و مـاڵ و خـزم و مـنداڵە، وە خـەوتن بەسـەر پشـتدا لـە خەودا بێ دەسەڵاتی و مردنە.. وە خەوتن بە لادا لە خەودا چاکەیە، وە هەروەها نیشانەیە نەخۆشی‌یە یان مردن.. وە راکشان لەژێر درەختدا لە خەودا نیشانەی زۆری منداڵ و نەژادە.

**٣٦-خۆشـیی:** خۆشـیی لـە خەودا نیشانەی ماتەمی‌یە، چونکە دژیەتی، وە لەوانەیە نیشانەی دەرچوون لە تەنگەتاوی بێت، وە لەسەر دەوڵەمەندی و هەژاری.

**٣٧-خواحافـیزی:** خوا حافیزی لە خەودا جیابوونەوەیە، خوا حافیزی پیاو بۆ ژنەکەی تـەڵاق دانـیەتی، وە خـوا حافـیزی هـاوڕێ بۆ هاوڕێکەی جیابوونەوەیانە، وە خوا حافیزی نەخۆش بۆ کەس و کاری یان خوا حافیزی لـێیان نیشانەی مردنیەتی.

**٣٨-خانوو:** ئەگەر خانووەکە خۆش بوو ئەوە نیشانەیەکی چاکە، وە ئەگەر خانوویەکی میریـی بـوو، ئـەوە هەواڵێك لە لایەن میریی‌یەوە ئەبیستی، وە ئەگەر خانوویەکی بچووك بوو، بەڵام رێك و چاك بوو ئەوە ئاسوودەیی خێزانی‌یە، بەڵام خانووی رووخاو ئەوە نیشانەیە لەسەر دۆڕاندنی ماددی.

**٣٩-خشـت:** خشتی لێکراوە لە خەودا نیشانەیە لەسەر ون بوونی پیاو یان ئافرەت لە کەسانی خاوەن خانووەکە.

# ( د )

۱-**دایك:** بینینی دایك لە خەودا بە تەندروستی‌یەکی باشەوە، بەڵگەیە لەسەر ژیانێکی درێژو بەختیار.. وە بینینی بە مردوویی بەڵگەیە لەسەر ژیانێکی ناخۆش.

۲-**دارو درەخت:** خەو بینینی بە دارو درەختی سەوزەوە خەوێکی باشە، درەختیش لە خەودا زۆرجار پیاوە یان ئافرەتە، ئەگەر بینیت سەر ئەکەوی بەسەر درەختێکدا دڵنیابە لەوەی کە دەرفەتێکی ئاسوودە چاوەڕوانت ئەکات، ئەگەر لە خەودا درەختێکی بڕاوت بینی مانای وایە رووخانێکی ماددی برادەرێکت ئەبینی.. بەڵام ئەگەر بینیت خۆت درەختەکە ئەبڕیت ئەوە خۆت تووشی دۆڕاندنێکی ماددی ئەبیت.. وە بینینی درەختێکی کەوتوو بە هۆی رەشەباوە یان گەردەلوول مانای وایە ناخۆشی روو ئەدات بە هۆی خزمانەوە.

۳-**دەرزی:** دەرزی لە خەودا رەمزە بۆ ئافرەتێکی سوودبەخش و چاك، وە دەزوو کردن بە دەرزی‌یەوە مژدەدانە بە جووت بوون. وە پێوە کردنی شتێکی تر بە دەرزی‌یەوە ئاگاداری‌یە، لە هەر یەکێ لە خەودا جلەکانی بە دەرزی ئەدووری‌یەوە بەڵگەیە لەسەر سارێژ بوونی زیانی، ئەگەر جلی خەڵکی پێ ئەدووریەوە ئەوە ئامۆژگاریان ئەکا و هیوای گونجاندنیان بۆ ئەخوازێ، وە ئەگەر پارچە قوماشێکی پێ پینە ئەکرد تۆبە دەکات لە باس کردنی کەسێك لە پاش ملە، وە شکانی دەرزی یان ون کردنی یان دزینی بەڵگەیە لەسەر لە دەست دانی کارێك لە کارەکان.. وە کوتانی دەرزی لە شانی کەسێکدا بەڵگەیە لەسەر تووڕە بوونی لێی.

**٤-دڵتەنگی:** دڵتەنگی مرۆڤ لە خەودا نیشانەیە بۆ نارەحەتی لە ڕۆژیدا، لەوانەیە دڵتەنگی نیشانەبێ بۆ هەڵسوکەوتی خراپ لە ئاگاداریدا.

**٥-ددان:** دەڵێن خەو بینین بە دانەوە باش نییە، بەڵام ئەم قسەیە بە هیچ شێوەیەك نابێ پشتی پێ ببەسترێ.. ئەگەر خەوت بینی دانێکی نوێت دەرهات مانای وایە هەواڵی منداڵێك ئەبیستی کە شوێنێکی گەورەی ئەبێ لە جیهاندا. وە خەو بینینت بەوە کە دانێکت لە کیس ئەدەیت مانای وایە تۆ هەواڵێکی ناخۆش ئەبیستی.

**٦-دەرگا:** دەرگا لە خەودا نیشانەیە بۆ پیاوی ماڵەوە، وە بەر دەرگا نیشانەیە لەسەر ژنەکەی، وە دەرگای کراوە سەرەتایەکی نوێ و سەرکەوتووە، وە دەرگای داخراو بەختێکی داخراوو بێ سوودە، وە شکانی دەرگا بە زۆر ناخۆشی یاساییە، وە دەرگا کراوەکان دەرگای ڕۆزییە، وە گۆڕانی دەرگای ماڵ بەو شێوەی گۆڕانە بۆ گوزەرانی پیاوی ماڵەکە.. وە دەرهێنانی دەرگای ماڵ یان کەوتنی یان سووتانی یان شکانی یان دزینی ناخۆشییە بۆی.

**٧-دەروازە:** دەروازەی کراوە بۆت لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئەوەی هەنگاوی نوێ بۆ ژیان ئەنێیت.. وە دەروازەی داخراو لە پێشتەوە نیشانەیە بۆ سەرکەوتن دوای ناخۆشی.

**٨-دەریا:** ئاوی هێمنی روون لە خەودا بەڵگەیە لەسەر پاشایەکی بەهێزی گەورە بۆ فەرمانبەرەکەی وەزیرەو بۆ وەزیرەکەی سەرکردەیەو بۆ بازرگان کەل و پەلەکەیەتی و بۆ قوتابی مامۆستاکەیەتی، وە بۆ کرێکاریش خاوەن کارەکەیەتی..ئەوەی لە خەودا لەو ئاوەی خواردەوە بەختیار ئەبێ یان فێر ئەبێ بە ئەندازەی خواردنەوەکەی وە ژیانی درێژ ئەبێ بە ئەندازەی ئەو ئاوەی ماوەتەوە، وە ئەگەر بە مەلە دەریاکەی بڕی ماڵی دوژمنەکەی دەوڵەمەند ئەبێ، وە لە ژیانیدا سەرئەکەوێ، وە لە نەخۆشییەکەی ڕزگاری ئەبێ ئەگەر نەخۆش بێت، وە ئەوەی بینی لە دەریادا خنکاوە لە خۆشی دنیادا ئەخنکێ.

**٩-دۆزەخ:** بینینی دۆزەخ لە خەودا نیشاندیە لەسەر ئاگاداری وە چوونە ناو ئاگرەکەوە چوونە ناو تاوانی گەورەیە.

**١٠-دیوار:** دیواری سادە نیشانەیە بۆ ستەم وە بۆ گۆڕانی شوێنی نیشتەجێ بوون وە دیواری بەرز نیشانەیە بۆ سەرکەوتن لە دوا ڕۆژدا.

**١١-دۆلکـه:** دۆلکـه لـه خـەودا ئەگەر ناوی پیسی تیا بێت یان تێی بکەوێت، ئەوە خەوێکی خراپە، بەڵام ئەگەر ئاوەکە یان ئەو شلەی تیایەتی پاك بوو ئەوە خەوێکی باشە.

**١٢-جـبه:** پۆشـینی جـبه لـه خـەودا نیشانەیە لەسەر جووت بوونێکی چاك، ئەگەر جبەکە بۆیە کراو بوو ئەوە ژنێکە کە منداڵی زۆرە.

**١٣-دانیشـتن لەسـەر سـفرە:** دانیشـتن لەسـەر سفرە لەگەڵ ئەندامانی خێزانەکەتدا مانـای بوونـی تێگەیشـتنە لـە نـێوان تۆو ئەواندا، چونکە دانیشتن لەسەر سفرە سۆزەو خـواردن لەگەڵـیاندا لەسـەر سـفرە مانـای نـاکۆکی نـێوان تـۆو ئەوانـە چونك خواردن ناکۆکی‌یە.

**١٤-دانیشـتن لەگـەڵ کۆمـەڵ:** دانیشـتن لەگـەڵ کۆمەڵێ خەڵك لە خەودا نیشانەیە لەسـەر هاوکـاری و تێگەیشـتن لەگەڵ پەیوەندی‌یەکی بەهێز، وە دانیشتن لەگەڵیاندا لە نهۆمـی سـێیەم یان نهۆمی چوارە یان لە بەرزترین خانوودا مانای وایە پەیوەندی‌یەکەت لە بەرزترین پلەدایە.

**١٥-دانەوێڵـه:** ئەگـەر لـه خـەودا لـه کـێڵگەیەکدا دانەوێڵـەت بینی، یان جوچکە نەیخوارد ئەوە گەشبینی‌یەکی باشە.

**١٦-دز:** خـەو بـه دزی ناسراوەوە مانای سەردانی میوانێکە، وە ئەڵێن تاوانبار کردنی کەسێکی ترە بە هەڵەیەك، وە دزی نەناسراو فریشتەی مردنە (ملك الموت).

**١٧- دوکانی بازاڕ:** دوکانی بازاڕ لە خەودا نیشانەی سامان و بازرگانی‌یە بە سامانی جۆراو جۆر.

**١٨-دوکانی بازرگانی:** وەستان لە بەردەمیدا بەبێ بازرگانی نیشانەی قسەی زۆرە.

**١٩-دیوار:** دیوار لە خەودا گوزەرانی پیاوە، وە لەوانەیە کە دنیاکەی بێت.

**٢٠-درەو:** درەو لـە خەودا بەڵێنە بە گۆڕان بۆ باشتر، وە باشتر وایە خۆت درەو بکەیت لە جیاتی ئەوەی کەسێکی تر درەو بکات.

**٢١-دەرچوون لە کەشتی:** دەرچوون لە کەشتی لەخەودا مانای دەرچوونە لە ناخۆشی.

**٢٢-دەرچوون:** دەرچوونی نەخۆش لە ماڵەکەی بە بێ دەنگی لە خەودا نیشانەی مردنیەتی، وە دەرچوونی بە قسەوە نیشانەی ژیانیەتی، وە دەرچوون لە دەرگای تەسکەوە نیشانەیە لەسەر رزگار بوون و ئاسایش لە شەڕو تەنگی کە تیایدایە، وە نیشانەیە لەسەر پەشیمان بوونەوە ئەگەر دەرچوونەکە بۆ گەردوونێکی فراوان بێت.

**٢٣-دوعا:** پاڕانەوە لە خوای گەورە ئەگەر لە خەودا پاڕانەوەکەت لێ وەربگرێ مانای وایە خوا وەڵامی دۆعاکەی داویتەوە، وە پاڕانەوەی پەنهان نیشانەی کوڕە، وە ئەگەر بە هاوارەوە بوو دوعاکە نیشانەیە لەسەر ناڕەحتی و ناخۆشی.

**٢٤-دەرمان:** خواردنی دەرمان لە خەودا مانای وایە سامانێك چاوەڕوانتە یان زانستێکت دەستگیر ئەبێ، وە ئەگەر دەرمانەکە بۆندار بوونیشانەی جووت بوونە بۆ هەرزەکارو مندالّە بۆ نەزۆك و دەوڵەمەندیە بۆ هەژار، بەڵام ئەگەر دەرمانت بە کەسێکی تر ئەدا، ئەوە نیشانەی ئەوەیە شتێکی بەنرخ ون ئەکەیت، وە دەڵێن خواردنی دەرمان لە خەودا نیشانەیە بۆ چاك بوونەوەی خێرا.

**٢٥-دنیا:** دنیا لە خەودا ئافرەتە وەکو چۆن ئافرەت دنیایە، ئەوەی بینی دنیای بۆ ئاسان بووەو ئەوەی ئەیەوێ بە دەستی هێناوە ئەوە هەژار ئەبێ.

**٢٦-دووکەڵ:** دووکەڵ لە خەودا خێرو بەرەکەتە. ئەگەر لە ماڵ چوویە دەر یان دورکان وە بۆ کەسێ تەنگەتاو بکرێ نیشانەی دۆڕانە، و دەڵێن خەوی دووکەڵاوی باش نی‌یەو بەئاگاداری دائەنرێ.

**٢٧-دومەڵ:** دومەڵ لە خەودا ماڵە بە رێژەی ماوەی مانەوەی وزۆریەکەی.

**٢٨-دۆڵاب:** دۆڵاب لە خەودا نیشانەی دەردی سەری‌یە لە ساماندا، ئەگەر خاڵی بێت، بەڵام ئەگەر دۆڵابەکە پڕ بێت لە پۆشاك ئەوە نیشانەی سەرکەوتنە.

**٢٩-دەرزی:** دەرزی لە خەودا نیشانەی ناخۆشی‌یە لەگەڵ هاوڕێ یان دراوسێدا، وە خەوت بەوەی کە چوویتە دەرەوە یان ئازار درایت بە هۆی دەرزی‌یەوە ئەوە کەسێکی تر پەشیمان ئەکەیتەوە، خەوەکە دابنێ بەوەی کە ئاگاداری‌یەو ئەتوانی لە تەنگ و چەڵەمە دوورکەویتەوە.

**٣٠-دالان**: دالانی درێژ لە خەودا ڕێگای ژیانە.

**٣١-داشتن، ئاودان**: ئاودان دژی تینوێتی‌یە، لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئاسانی دوای ناڕەحەتی، وە بەجێ هێنانی پێویستی‌یە، وە دەوڵەمەندی‌یە دوای هەژاری.

**٣٢-دزی**: دزی لـە خـەودا نیشانەیە لەسەر بوونی چەند کەسێك بە چواردەورتەوە کە جێگەی متمانە نین.

**٣٤-دارشـتە**: دارشتەی ئاڵتوون لە خەودا بەختێکی خراپە بۆ پیاو، ڕەمزە بۆ ڕوودانی ناڕەحـەتی، تیاچـوونی سامانە بە ئەندازەی ئەو دارشتنە، وە بۆ ئافرەت ڕازانەوەو جوانی‌یە لە دنیایاندا.

**٣٥-ددان کـەوتن**: ددان کـەوتن لـە خەودا نیشانەیە لەسەر تەمەنێکی درێژ، ئەگەر بینیـت هـەموو ددانەکانت کەوتن و بە دەست هەڵت گرتن یان خستە کونێکەوە ئەوە زۆر ئەژیـت تـاوەکو ددانەکانـت ئەکـەون، وە ژمـارەی خێزانەکەتان زیاد ئەکات، ئەوەی بینی هـەموو ددانـەکانی کـەوتن و لـێی گوم بوون ئەوە کەسەکانی پێش ئەو ئەمرن، وە ون بوونی یەك ددان ون بوونی هاوڕێ‌یەکە یان خزمێك.

**٣٥-دەوار. خـێمە**: دەوار لـە خـەودا گەشبینی‌یەکی باشە، وە چوونە ناو دەوار مانای سەرکەوتن و زاڵ بوونە بەسەر بەرامبەرەکەتدا، ئەوەی دەبێ بە خاوەنی دەوارێکی داکوتراو لە خەودا نیشانەیە لەسەر دەسەڵات و هێزی.

**٣٦-دڕك**: بینینی دڕك لە خەودا نیشانەیە لەسەر ڕووداوێکی ئاسان یان لە کۆتاییدا چارەسەر نەکرێ.

**٣٧-درەخـت**: درەخـت لە خەودا ڕەمزە بۆ پیاوو ئافرەت، درەختی چاك ڕەمزە بۆ وتەی چـاك و پـیاوی چـاك، وە ڕەمزیشە بۆ دەروون و ئیشی خەو بینەکە، وە بینینی درەختێکی سـەوزی گەشـاوە لـە خەودا نیشانەیە لەسەر ژیانێکی بەختیار، وە بینینی درەختی وشك نیشانەیە لەسەر ژیانی وشك، وە کەوتنە خوارەوە لە درەختێکەوە نیشانەیە لەسەر دووچار بوونی ناڕەحەتی.

**٣٨-دەنگ:** دەنگی مرۆڤ لە خەودا ناوبانگ و باس کردنیەتی، ئەوەی بینی دەنگی بەهێزە لە خەودا ئەوە هاواریەتی لە خەڵکی، ئەوەی بینی دەنگی لاوازە ئەوە پێچەوانەی ئەوەیە، بیستنی دەنگی زوڵاڵ و خۆش نیشانەیە لەسەر خێرو دەروازە، وە بیستنی دەنگی نەناسراوو نائاشکرا نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی ، وە بیستنی دەنگی یەکێك لە باوان نیشانەیە لەسەر ژیان، وە بیستنی دەنگی منداڵەکەت نیشانەی ڕوودانی ناخۆشی‌یە بۆی. وە دەڵێن بیستنی دەنگێك لە خەودا قسەت لەگەڵدا بکات پێویستە ئاگاداری‌یەکی باشی بکەیت چونکە نامەی کت لەو کەسەوە بۆ ئەهێنێ کە خۆشت ئەوێ، وە وا ئەبێ ئەگوازێتەوە بۆ ئاسمان و ئاگاداری کارەکەت ئەبێ، ئەگەر قسەکە مانایەکی ئاشکرای هەبوو ئەوە چیت پێ ئەڵێ بە گوێی بکە، بەڵام ئەگەر نائاشکرا بوو وە دڵخۆش بوو ئەوە مانای دڵخۆشی‌یە، بەڵام ئەگەر دەنگەکە غەمگین بوو ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ غەم و ناڕەحەتی.

**٣٩-دەنگی شەیپور:** ئەگەر دەنگەکە ڕێك و پێك بوو، وە لە شێوەی ئاوازێکی مۆسیقیدا بوو ئەوە خەرێکی خۆشەو چاوەڕوانی هەواڵی باش بە، بەڵام ئەگەر ڕێك و پێك نەبوو ئەوە هەواڵەکە ناخۆش دەبێت.

**٤٠-ددانی خڕێ:** ددانی خڕێ لە خەودا گەورە پیاوانی خەو بینەکەیە، یان باشترینیان، ئەگەر ددانی خڕێ کەوت یان دانەکانی نیشانەیە لەسەر ناتەواوی لە ساماندا یان لە دەروونندا.

**٤١-دەرکردن:** ئەگەر لە خەودا کەسێکت دەرکرد یان هاوارت لێکرد، نیشانەی تووش بوونتە بە کێشەو ناڕەحەتی زۆر.

**٤٢-درێژیی دەست:** درێژیی دەست لە خەودا مانای چاکەو چاکە کردنە.

**٤٣-داردەست:** ئەگەر لە خەودا داردەستت بە دەستەوە بوو نیشانەی ئەوەیە پشت بە پیاوێکی بەهێز ئەبەستیت وە ئەوەی داوای دەکەیت وە سەرئەکەوی بەسەر دوژمنەکەتداو سامانەکەشت زیاد ئەکات، ئەگەر دار دەستەکە شکا ئەوە نیشانەی ناڕەحەتی‌یە.

٤٤-**دێـو:** دێوی سپی لە خەودا نیشانەیە لەسەر غەم، وە دێوی ڕەش نیشانەیە لەسەر بەختەوەری، بەڵام ئەگەر یەکێکتان قسەتان نەکرد، نیشانەی مردنی کەسێکە لە هاوڕێ یان لە کەس و کار.

٤٥-**دەرگـا داخسـتن:** ئـەوەی لـە خـەودا دەرگایـەکی ناسـنی دائەخست ئەوە ژنێکی خانەدان ئەهێنێ ئەگەر هەرزەکار بێت، وە ئەگەر ژنی هەبێ لـێی جیا ئەبێتەوە.

٤٦-**دابێژان:** دابێژان لە خەودا نیشانەیە لەسەر بەدەست هێنانی شکۆداری و لەسەر تەواو بوونی پارە، وە لەسەر جیاوازی کردنی قسەی چاك و خراپ.

٤٧-**دراو:** دراوی برۆنـزو نـیکل لـە خـەودا قسـەی ناشیرین و نەڕاندنە، وە دراوی زیو ڕۆزیی باشەو سەرکەوتنە لە کاروباردا، وە دراوی کاغەز قسەی خراپە.

٤٨-**دۆڕانـدن:** خـەوت بـە دۆڕاندنـەوە لـە کارەکەتدا یان خۆشەویستەکەتدا یان لە ژیانتدا مانای سەرکەوتنە لەو کارانەدا.

٤٩-**درۆ:** درۆ لـە تەفسـیردا مانـای ناڕەحـەتی نوێیـە، ئەگەر کەسێکت بینی درۆی لەسەر ئەکردی مانای وایە کەسێ هەیە ناپاکیت لەگەڵ ئەکات.

٥٠-**دەوڵەمـەندی زۆر:** دەوڵەمـەندی زۆر لـە خـەودا مانایـەکی نییـە ئەوە ئەبێ تۆ سامانێکی زۆر داوا ئەکەیت کاتێ بە ئاگایت بۆیە لە خەوەکەتدا ڕەنگ ئەداتەوە.

٥١-**دز:** دز لـە خـەودا فریشتەی مردنە یان هاتنی سەفەر کەرێکە یان داوا کەرێ، وە دەڵـێن نەخۆشـی و دەردە، ئەگـەر دزەکـە ڕەش بـوو ئـەوە ڕەشـییە ئەگەر سپی بوو ئەوە بەڵغەمە، ئەگەر زەرد بوو ئەوە زەردییە، ئەگەر سوور بوو ئەوە خوێنە، وە دەڵێن ئەگەر دز چـووە ماڵـێکەوە ئـەوە لە سەرچاوەیەکی دیاری نەکراوەوە دەبەخشێ بە خاوەنەکەی، وە دز گرتن لە خەودا نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی ماددی.

٥٢-**دەسـت کردنە مل:** دەست کردنە مل لەخەودا نیشانەی سۆزە، ئەوەی دەست بکاتە ملـی کەسـێ ئـەوە تـێکەڵاوی ئەبێت، ئەوەی دەست بکاتە ملی دوژمنەکەی ئەوە ئاشت ئەبێتەوە لەگەڵیدا وە دوژمنایەتیان نامێنێ، ئەوەی بینی دەست ئەکاتە ملی ئافرەتێ ئەوە

دەست ئەکاتە ملی دنیا وە دەست کردنە ملی پیاو نیشانەیە لەسەر دەست کردنە مل و دەست گیرۆیی و یارمەتی دان.

**٥٣-دەستە سڕ:** دەستەسڕ لە خەودا نیشانەی خۆشەویستی‌یە وە دەستە سڕی جوان و خاوێن و رەنگین نیشانەیە لەسەر جووت بوون، وە دەستەسڕی سەرسوڕهێنەر نیشانەیە لەسەر جیابوونەوە لە خۆشەویستیدا، وە دەستەسڕی پیس نیشانەی بەخت خراپی‌یە.

**٥٤-دانەر:** بینینی دانەر لە خەودا مانای ناڕەحەتی‌یە لە ئەنجامی کاری ئەدەبیدا یان تایبەت بە کتێب و رۆژنامەکان.

**٥٥-دواندنی سەرکردەکان:** دواندنی سەرکردەکان و دواندنی پادشاو سەرکردەکانی دەوڵەت و وەزیرەکان لە خەودا مانای بەرزی و شەرەف و پیاوەتی و سەرکەوتنی خێرایە.

**٥٦-داڵ، هەڵۆ:** لە خەودا ئەگەر بفڕێ بە هێواشی ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ بەختێکی ئاناسوودە، کە مانای دۆڕاندنە.. ئەگەر بەبەرزی فڕی مانای سەرکەوتنە.. باشتر وایە مرۆڤ بە شێوەیەك ببینێ کە بەرەو رووی بێت، نەوەك پشتی لەم بێت.. وە بینینی باڵندەیەکی گەورە کە دانیشێ لەسەر هێلانەکەی یان لەسەر درەختێ بە بەرزی نیشانەیەکی چاکە کە مژدەی بەختیاری پێیە لە ئیش و کارو خۆشەویستیدا.

**٥٧-دارخورما:** دارخورما لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاوی چاك و پیرۆز وە لەسەر وشەی چاك، وە بینینی نیشانەی ئەوەیە سەرئەکەوی بەسەر ناڕەحەتیەکانتدا، وە سەرئەکەوی لە کارەکانتداو پیاوێکی سوودمەند یارمەتیت ئەدات.

**٥٨-دابەزین:** ئەوەی لە خەودا بینی لە شاخێك ئەهاتە خوارەوە ئەوە باشە.. لەوانەیە دابەزین نیشانەی ئاژارە بێ، ئەوەی بینی لە شوێنێکی بەرزەوە ئەهاتە خوارەوە یا رووبەك یا کۆشکێك ئەوە ئەگەڕێتەوە دۆخی جارانی، ئەوەی بینی لە پلیکانەیەکی کۆنەوە ئەهاتە خوارەوە ئەوە نیشانەی جێ بە جێ بوونی ئاواتەکەیەتی، ئەگەر پلیکانەکە شکاو ئەویش لەسەری بوو ئەوە سەر ئەکەوێ بەسەر دژەکەیدا.

**٥٩-دیاری:** دیاری لە خەودا شادی‌یە، وەنیشانەی خۆشەویستی و سۆزە، وە نیشانەی ئاشت بوونەوەی دوو ئاکۆکە، وە ئەڵێن داخوازی ژن هێنانە، ئەوەی بینی قاپێکی

پێشکەش کرا کە میوەی تێدا بوو، ئەوە کچەکەی شوو ئەکات، وە ئەگەر کچی نەبوو ئەوە سۆز لە نێوانی ئەم و خاوەن دیارییەکەدا دروست ئەبێت.

٦٠-**دەست نوێژ:** ئەوەی لە خەودا بینی دەست نوێژ ئەگرێت بۆ نوێژ ئەوە پارێزراوە لەو دوژمنەی لێی ئەترسا، ئەوەی بینی لەش پیسی دەرئەکا شتێکی دەست ئەکەوێتەوە کە لێی دزرابوو، ئەوەی بینی دەست نوێژی گرت ونوێژی کرد ئەوە لە خەمێکی گەورە دەربازی ئەبێ.. ئەوەی بینی بە بێ دەست نوێژ نوێژی کرد ئەگەر بازرگان بێ ئەوە بازرگانییەکەی بێ سەرمایەیە، ئەگەر پیشەساز بێ ئەوە جێگای نییە، ئەگەر خاوەنی دەسەلات بێ ئەوە سەربازی نییە.

٦١-**دۆڵ:** ئەگەر لە خەودا بوویت و کۆتایی بە گردۆلکەی گەورە یان شاخ ئەهات نیشانەی نەخۆشییە بۆت یان بۆ کەسێکی ئازیزت.

٦٢-**دەست:** ئەگەر لە خەودا بە دەستی راستت نیشت ئەکرد مانای سەرکەوتنە، وە بە دەستی چەپ مانای دۆڕاندنە، دەستی راست هێزو گوزەران و دەستکەوت و چاکەی خەوبینە، ئەوەی بینی دەستی درێژ بووەو بەهێز بووە ئەگەر سەرۆك بێت ئەوە بەسەر دوژمنەکەیدا سەرئەکەوێ.

❁ **دەستی سپی:** دەستی سپی لە خەودا نیشانەی قازانجێکی زۆرە، وە کاری چاکەو خێریش.

❁ **دەستی درێژ:** دەستی درێژ لە خەودا نیشانەیە لەسەر هێزو چاکەو درێژیی ژیان.

❁ **دەستی کورت:** دەستی کورت لە خەودا نیشانەیە لەسەر بەغالەت و کەمی نەمەن.

❁ **دەستی بڕاو:** دەستی بڕاو لە خەودا نیشانەیە لەسەر تەلاقی ژن یان فەوتانی هاورێ.

❁ **دەستی پیس:** دەستی پیس لە خەودا نیشانەیە لەسەر گوم کردنی پارە لە ناپاکیدا.

٦٣-**دەریاوانی:** مەلە کردن لە کەشتییەکدا لە خەودا بەڵگەیە لەسەر جووت بوونێکی بەختیارو ژیانێکی ئاشتی و ئاسوودە.

# ( ر )

**١-ڕۆیشتن بە هەوردا:** ڕۆشتن بە هەوری بێ گەرددا مانای بەدی هاتنی فرمانێکی گەورەیە لە زانست و دانایی، وە ڕۆشتن بە هەوری لێڵدا ئاگاداری و وریا کردنەوەیە.

**٢-ڕۆشتن:** ڕۆشتنت بە تەنیا لە خەودا نیشانەیە بۆ سەرکەوتن، ڕۆشتن لەگەڵ کەسانی تردا کە پێشت ئەکەون نیشانەیە بۆ دۆڕاندن، وە ڕۆشتنت بە دوای دوژمندا نیشانەیە بۆ سەرکەوتن و زاڵ بوون، ڕۆشتن بە ڕێگایەکی ڕێکداو لە خەودا نیشانەی ڕێك وەستانە، وە ڕۆشتن بە بەرزو نزمیدا نیشانەیە لەسەر لەمپەرو دواکەوتنی کاتی، ڕۆشتن لە ڕۆشناییدا نیشانەیە لەسەر ڕێنمایی و سەرکەوتن، وە ڕۆشتن لە تاریکیدا مانای وایە تۆ بەرەنگاری ناڕەحەتییەك ئەبیتەوە کە نایزانی بە چ ڕێگایەك دەرباز ئەبیت لێی، وە خەون بە ڕۆشتنەوە بە ڕێگەیەکی دژوارو ناڕەحەتدا نیشانەی نەخۆشییە یان دۆڕانت یان دۆڕانی کەسێکی ئازیزت. وە ئەگەر لەگەڵ کەسێکدا ئەڕۆشتی وخۆشت نەئەویست یان ئاکۆکیت لەگەڵدا ئەکرد، ئەوە ئاگادارییە لە ناڕەحەتییەکی داهاتوو کە ئەتوانی هەستی پێ بکەی ئەگەر بە داناییەوە هەڵسو کەوت بکەیت.

**٣-ڕۆشتن بە پێی پەتی:** ڕۆشتن بە پێی پەتی لە خەودا مانای دوا ڕۆژێکی پڕ لە سەرکەوتن و پڕ لە هەدنی بەختیارییە.

**٤-ڕۆشتن بەسەر قاچی تەختەییەوە:** ڕۆشتن بەسەر قاچی تەختەییەوە لە خەودا مانای نووشتەیە پێش ڕوودانی کار.

**٥-ڕێنمایی:** ڕێنمایی دوای گومڕایی لە خەودا بەڵگەیە لەسەر تووش بوون بە خێرو چاکە، وە ڕێنموونی بوون و زانینی ڕاست و پێویستییەکان.

٦-**رەنگەکان:** ئەگەر خەوت بینی بە جلێك یان شتێکی ڕەنگین، ئەگەر ڕەنگەکە ڕەش بوو ئەوە نیشانەی دۆڕاندن و ناکۆکی و خەفەت و ئازارو مردنە یان ئاگاداری‌یە بۆ هەواڵی ناخۆش.. وە هەندێ جار نیشانەیە بۆ سەرکەوتن و بەختیاری.. وە ئەگەر ڕەنگەکە شین بوو ئەوە هاوڕێی دڵسۆزت هەیە، وە ئەگەر سوور بوو واتە بە لای سووردا دەشکایەوە ئەوە تۆ دوژمنت هەیە، وە ئەگەر سەوز بوو ئەوە سەرکەوتن و بەختیاریت لە پێشەوەیە، وە ئەگەر سپی بوو ئەوە نیشانەی جوانی‌یە لە ئایین و دنیادا، وە دەڵێن بەڵگەی پاکی و ناسکی و بێ تاوانی‌یە، وە ئەگەر زەرد بوو ئەوە بەختێکی ئاسوودە چاوەڕێت ئەکات ئەگەر ئافرەت بێت، بەڵام بۆ پیاوان نیشانەی نەخۆشی و لاوازی‌یە، وە ئەگەر ڕەنگەکان زۆر بوون لەگەڵ یەکتر ئەوە گۆڕانکاری‌یەکی نزیك لە ئارادایەو کار تێکردن لە چەند لایەنێکی جیا جیاوە بۆ تۆ لە ئارادایە.

٧-**ڕزگاری:** ئەوەی لە خەودا بینی ڕزگاریی پێ درا، ئەوە هەموو کات دڵ ئەمین ئەبێ لەوەی ئاگاداریی خۆی لێ ئەکات.

٨-**ڕایەخ:** ڕایەخ لە تەفسیردا دنیایە بۆ خاوەنەکەی، وە ڕاخستنی ڕایەخ ڕاخستنی دنیایەتی، وە فراوانی ڕایەخ فراوانی ڕۆزی‌یەکەیەتی، وە بچووکی ڕایەخ و تەنکی واتای کەمی ژیان و کەمی کارە، وە قەبارەکەی قەبارەی ڕۆزیی و تەمەنە، وە ڕایەخی نوێ و فراوان درێژیی تەمەن و گوزەران باشی‌یە، وە ڕایەخی کۆن بوو خێری تێدا نی‌یە، وە ڕاخستنی ڕایەخ لە نێوان کۆمەڵێکی ناسراودا یان لە شوێنێکی زانراودا مانای بەشداری‌یە لە ڕۆزی ئەو کۆمەڵە لەو جێگایەدا.

٩-**ڕێکخستنی کاروبار:** ڕێکخستنی کاروبار لە خەودا نیشانەیە لەسەر بەرزی هەوڵ دان و چارەنووس.

١٠-**ڕێوی:** ڕێوی لە خەودا پیاوێکی ناپاکی فێڵ بازی تەڵەکە بازی ڕاڕایە لە ڕاستی.

١١-**ڕووداو:** ڕووداو لە خەودا نیشانەیە لەسەر ڕووداو لە ئایندا، ڕووداوی بچووك گوناهی بچووکەو ڕووداوی گەورەش گوناهی گەورەیە، ئەوەی بینی تووشی ناڕەحەتی بووە

ئـەوە نیشـانەی سـەرکەوتنێکی مسـۆگەرە بـۆی، بـەڵام سەرکەوتنێکی هێواش، خەو بە ڕووداوەوە نیشانەیە لەسەر تەواوبوونی ناڕەحەتی.

**١٢-رنـین:** ئەگـەر کەسـێکت بینی رنەرەوەی پێ بوو لە خەودا، ئەوە هەواڵی ناخۆش ئەبیسـتی، بـەڵام ئەگـەر ئەتـرنیـیەوە لـە خـەودا ئـەوە دۆڕانـدن تووشـت ئەبێ بە هۆی هەڵسوکەوتی هاوڕێیەکی درۆزنەوە.

**١٣-رێحانـە:** رێحانـە هەمووی ئەگەر لە خەودا بینرا بە کەندراوی نیشانەیە لەسەر گریان و ناخۆشی و خەفەت، وە ئەگەر بە جێگیری بینرا لە شوێنی خۆیدا، ئەوە نیشانەیە لەسـەر حەوانـەوەو جـووت بـوون، یـان کـوڕ.. وە بینـینی درەخـتی رێحانە نیشانەیە بۆ سـەرکەوتن لـە کـاردا، ئەگـەر خەوت بینی رێحانە کۆ ئەکەیتەوە ئەوە هەواڵێکی خۆش ئەبیسـتی یـان لـە خۆشەویسـتەکەتدا بەخـتەوەر ئەبیت، ئەمانە هەموویان لە کاتێکدا رێحانە گەشاوە بێت و رووپاراو بێت.. بەڵام ئەگەر چڵەکە مردوو بێت و رێحانەکەش سیس ئەوە خەوەکەت پێچەوانەی ئەوانەیە.

**١٤-رەشـەبا:** رەشـەبای ئاسان لە خەودا چاوەڕوانی ناخۆشییە لە دوا رۆژێکی نزیکدا کـە ئەنجامەکـەی دڵخـۆش کـەر ئـەبێ.. وە رەشـەبای بەهـێز مانای گۆڕانی گوزەرانە بە شێوەیەکی توندو هەرکاتێ رەشەباکە هێمن بوویەوە گوزەرانەکەش هێمن ئەبێتەوە.

**١٥-رۆن، زەیـت:** بینـینی رۆن لە خەودا رۆزی و ماڵی حەڵاڵە.. ئەوەی خۆی پێ چەور ئـەکات چـاك بوونەوەیـەو ئەوی بیخوات نەخۆشییە، وە رۆنی زەیتون لە خەودا زانست و رۆزی و فـەڕو چاك بوونەوەیە.. وە جۆری تر لە رۆن سامانە.. وە هەندێ جار رۆن نیشانەیە لەسـەر روونـاکی چـاوو روونـاکی دڵ و هـەندێ جـار نیشـانەیە لەسـەر دیـاری کردنی منداڵەکان.

**١٦-رازانـەوە:** رازانـەوە لە خەودا نیشانەیە لەسەر هەژاری و خراپی گوزەران، ئەوەی بینی دنیای بۆ رازاوەتەوە، ئەوەی داوای کردووە پێی دراوە ئەوە هەژار ئەبێ.

**١٧-ریشوو:** ئەگەر لە خەودا پۆشاکێکت لەبەر ئەکرد ریشووی پێوە بوو ئەگەشایەوە ئەوە بەڵێنە بە ئاسوودەیی لە خۆشەویستدا یان بەختیاری خێزانی، وە ئەگەر تۆ ریشووت ئەدووریەوە بە بەرگی کەسێکدا ئەوە پەیمانە بە هەواڵی خۆش.

**١٨-رووپۆش، پەردە:** پەردە لەسەر دەرگا یان پەنجەرە یان لە خەودا غەم و ترسە لە ناسایشی داهاتوو.. پەردە لەسەر دەرگای ماڵ غەمە لە لایەن ئافرەتەوە بۆ خەوبینەکە.. وەپەردە لەسەر پەنجەرە غەمە لە لایەن کەسانێکەوە کە ناچنە دڵەوە.. وە پەردە لەسەر دەرگای کارگە غەمە لە بواری مووچەدا.. وە لەسەر دەرگای مزگەوت غەمە لە ئایینـدا.وە پەردەی پیس غەمەو زوو بەسەر ئەچێ.. وە پەردەی نوێ غەمی درێژ خایەنە.. وە پەردەی دڕاو بە درێژیی دەروویەکی خێرایە، وە پەردەی دڕاو بە پانی ناموسی خاوەنەکەیەتی.. وە لەرینەوەی پەردە بە هەوا نیشانەی ترسناکی‌یەکی کت و پڕی‌یە.. ئەگەر کەسێکی ترساو وای ئەزانی پەردەیەکی بەسەرەوەیە ئەوە پەردەی بەسەرەوەیە.. وە هەرکاتێ پەردەی دەرگاو پەنجەرەکان گەورەبن ئەوە خەفەت و غەمی گەورەو توندو تیژن.

**١٩-رەندە:** رنە لە خەودا نیشانەیە بۆ زمان ئەگەر تیژ بوو، ئەوە تیژی زمانە، وە ئەگەر سارد بوو ئەوە ساردی زمانە.

**٢٠-رۆژوو:** ئەوەی بینی لە خەودا بە رۆژووە تووشی بەرزی و شەرەف ئەبێ، ئەوەی بینی لە مانگی رەمەزاندایەو بە تەنها بە رۆژووە یان لەگەڵ خەڵکیدا، ئەوە پیاوێکی چاك و باوەڕدارە، ئەگەر غەمبار بوو خوا دەرووی لێ ئەکاتەوە، وە ئەگەر نەخۆش بوو خوای گەورە شیفای ئەدات،ئەگەر لە گومڕاییدا بوو خوا رێنموونی ئەکات، ئەگەر قەرزار بێت خوا قەرزەکەی دابێن ئەکات، ئەوەی بینی بەدەست ئەنقەست لە مانگی لە رەمەزاندا رۆژووەکەی ئەشکێنێ، ئەوە بە دەست ئەنقەست پیاوێك ئەکوژێ، وەکو چۆن ئەگەر بینی بەدەست ئەنقەست پیاوێکی کوشتووە لە خەودا ئەوە لە مانگی رەمەزاندا بە رۆژوو نابێت.

**٢١-رۆژنامە:** رۆژنامە لە خەودا نیشانەیە لەسەر ژن.. ئەگەر رۆژنامەکە باش و هەواڵێکی دڵخۆشکەر بوو ئەوە نیشانەی ژنێکی چاکە.. وە ئەگەر هەواڵەکان خۆش نەبوون و شێوەی سەرنج راکێش نەبوو ئەوە نیشانەی ژنێکی خراپە، رۆژنامەی کراوە مژدەو

دڵخۆشی و سەرکەوتنە بۆ کەسێ وەری بگرێت، وە وەرگرتنی رۆژنامە بە دەستی راست نیشانەی خێرەو بە دەستی چەپ نیشانەی پەشیمانی‌یە..

**٢٢-راو بە تفەنگ:** ئەگەر خەوت بینی راوت ئەکرد بە تفەنگ یان گوێت لە دەنگی تەقەوە بوو، ئەوە خەوێکی دڵخۆشکەرە، بەلام ئەگەر ئەترسایت ئەوە ئاگاداریی ناڕەحەتی‌یە، وە ئەگەر خۆت راوت ئەکردو باڵندەکە یان ئاژەڵەکە مردار بوویەوە ئەوە ناڕەحەتی‌یە بۆ تۆ لە پێشدا، بەلام ئەگەر نێچیرەکە نەمرد ئەوە ناڕەحەتی‌یەکە ئاسانە.. وە خەو بینینت بەوەی کە یەکێکی کە تۆی راو کرد، ئەوە دوژمنێکت هەیە نایناسی.

**٢٣-راوی ماسی:** ئەگەر راوی ماسیت ئەکرد، یان بینیت ماسی‌یەك راو کرا، بە راستیی ئەوە سەرکەوتنە لە کاروباردا.

**٢٤-رووناکی:** بینینی رووناکی لە خەودا نیشانەیە لەسەر پەیامنێر یان زانست یان رێنوومایی، وە هەندێ جار نیشانەیە لەسەر هۆشیارکردنەوە بۆ پێویستی ئیش کردن لە رۆشنایی‌دا.

**٢٥-رێگا:** رێگا لە خەودا رێ نیشاندەری رێگای ژیانە، ئەگەر رێگاکە راست و فراوان و پان و سێبەری بوو، ئەوە ژیانی خەوبینەکە ئاسوودەیی و رێگاکەی راست و فراوان وپانە.. وە ئەگەر راست نەبوو وە لاری یان بەرزو نزمی تێدا بوو، ئەوە ژیانیشی بەو جۆرەیە.. وە رێگای نهێنی لە خۆبایی بوون و داهێنانە. وە رێگای جۆراو جۆر سەرسوڕمان و لەرەلەرە، وە رێگای لێتێکچوو نیشانەیە بۆ گومان، وە ئەوەی رێگاکەی لێ قەدەغە بکرێت، ئەوە نیشانەی وەستانە لە کاروباری ژیانیدا.

**٢٦-رووتی:** خەوی رووتی نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی، ئەگەر خەوت بینی بە رووتی لە کۆگایەك دابەزیت نیشانەی حەیاچوونی فرمانێکە لە فرمانەکانت، ئەگەر رووتەکە لە شوێنێکی دووردا بوو دوور لە چاوی خەڵکی، نیشانەی ئەوەیە دوژمنەکەت دەگەڕێ بە دوای شوێن پێکانتداو ناشی دۆزێتەوە، وە ئەڵێن رووتی لە خەودا نیشانەی بێ زیانی‌یە لە لایەن دەروون پیسەوە، ئەوەی بینی لە شوێنێکدا بەتەنها رووتە، دوژمنەکەی داوای شتێکی لێ ئەکات کە توانای نی‌یە بەسەری‌دا، ئەوەی خۆی بینی‌یەوە بە رووتی لە

جێگایەکی گشتی‌دا ئەوە فرمانەکەی بۆ خەڵکی ئاشکرا ئەبێت، ئەگەر شەرمی ئەکرد لە خەڵکی بە هۆی رووتیەکەوە نیشانەی زیانە بە سامانەکەی، ئەگەر شەرمی لە خەڵکی نەئەکرد زیاد لە حەد چووەتە ناو فرمانێکەوە، بەڵام بینینی مرۆڤی رووت ئەوە نیشانەی حەیاچوون و ترسە، وە بینینی ئافرەتی رووت لە خودا نیشانەی ئاسوودەیی و خۆشی‌یە، وە ئەڵێن خەو بە رووتی‌یەوە نیشانەیە بۆ ئاشتی و ئاسایش و دوا رۆژی باش بۆ خەو بینەکە، چونکە فرمانەکانی بۆ خەڵکی ئاشکرا ئەبێ و فێڵیان لێ ناکات، وە دەڵێن بە گشتی بەختێکی خراپە بۆ خەو بینەکە.

**٢٧-رەورەوە:** رەورەوە لە خەودا نیشانەیە لەسەر بەرێوەبردنی گوزەرانی خاوەن خەو، وە رەورەوە و رەورەوەی خێرا رەو نیشانەیە لەسەر خێرایی سەرکەوتن، ئەوەی سواری رەورەوە بوو لە خەودا، ئەگەر بیەوێ سەفەر بکات سەفەرەکەی دوا ئەکەوێ، وە وەستانی رەورەوە یان کۆمەڵە رەورەوەیەك لە رۆیشتن نیشانەیە بۆ گۆڕانکاری حاڵی خەوبینەکە.

**٢٨-رانە ئاژەڵ:** بینینی رانە ئاژەڵ لە خەودا بەڵێنە بە سەرکەوتن.

**٢٩-رووبەند:** خەو بینین بە رووبەندی رەشەوە نیشانەی جیا بوونەوەیە لەوەی کە خۆشت ئەوێ، بەڵام روو بەندی سپی مانای جووت بوونە.

**٣٠-رق لێ بوونەوە:** رق لێ بوونەوە لە خەودا خۆشەویستی‌یە، ئەوەی لە خەودا بینی رقی لە کەسێکە لەوانەیە ببێتە هاوڕێی، وە ئەگەر بینی رقی لە ئافرەتێ دەبێتەوە لەوانەیە مارەی بکات ئەگەر هەردووکیان عازەب بن.

**٣١-رۆشنایی:** بینینی رۆشنایی لە خەودا مانای رێنمومایی و بەختیاریی گەشاوەیە، وە هەروەها رۆشنایی بەڵگەی دەوڵەمەندی و سەرفرازی و هێزەو هەروەها نیشانەی زانست و کوڕی چاکە، ئەوەی رۆشنایی لەبەر ماڵەکەی‌دا بینی کوڕێکی ئەبێ کە بە کرداری ئەحەسێتەوە.

**٣٢-رووبار:** خواردنەوە لە ئاوی رووبار نیشانەیە لەسەر ژیانێکی خۆش و کامەران، ئەگەر ئاوەکەی روون بێت، بەڵام ئەگەر ئاوەکەی لێڵ بێت خواردنەوە لێی نیشانەیە

لەسەر ترسان و تۆقین، خۆ شۆردن لە ئاوی رووبار لە خەودا غەم و خەفەت لائەبات لە کاتێکا هەست بە ترس نەکەیت لە رووبارەکەدا.

**٣٣-راکردن:** راکردن لە شتێك لە خەودا مانای سەرکەوتن و بە دەست هێنانە، وە دەڵێن هەوڵ دانت بۆ راکردن لە ترسناکی‌یەك مانای ناڕەحەتی راستەقینەیە.

**٣٤-رووخانی ماڵ:** وێران بوونی ماڵ نیشانەی مردنی خاوەنەکەیەتی، وە مردنیش نیشانەی رووخانی ماڵە، ئەوەی بینی خانوویەك یان بینایەکی کۆن تێك ئەدا ئەوە تووشی غەم و شەڕ ئەبێ، ئەوەی بینی خانووەکەی ئەڕوخێ بەسەریدا یان هەندێکی ئەوە مرۆڤێك لەناویا ئەمرێ، یان خاوەنەکەی تووشی ناڕەحەتی‌یەکی گەورە ئەبێ یان رووداوێکی گەورە.. وە ئەگەر ئافرەتێ بنمیچی خانووەکەی بینی ئەڕووخا ئەوە مێردەکەی ئەمرێ. رووخانی بەشێك لە خانوو ناتەواوی‌یە لە ئایینداا.

**٣٥-رووخسار:** رووخسار لە خەودا ئەگەر بە باشی‌بینیت، ئەوە نیشانەی چاکی حاڵە لە دنیادا، ئەگەر بە رەشی بینیت ئەوە نیشانەی مژدەیە بە کچ، بۆ کەسێ ژنێکی سك پڕی هەبێ، ئەگەر ژنەکەی سکی پڕ نەبێت ئەوە نیشانەی تاوانباری‌یە، وە زەردی رووخسار نیشانەی ریسوایی ئێرەیی و دوو روویی‌یە.

**٣٦-رۆشتن بە شەو:** خەو بینیت کاتێك کە بە شەودا ئەڕۆیت مانای وایە شتێك هەراسانی کردوویت و تەنگی پێ هەڵچنیوی.. مەگەر لەو کاتەدا مانگ گەشاوە بێت، ئەوە [illegible]کەی باش دەبێت.

**٣٧-راستگۆیی:** راستگۆیی لە خەودا ئیمان و ئیمانیش راستگۆیی‌یەو دەرباز بوونە لە فرت و فێڵ.

**٣٨-رستن:** رستن لە خەودا سەرکەوتنە لە خۆشەویستی و کاروباردا، بەڵام ئەگەر دەزووەکە بە لاری و بە ناڕەحەتی بەڕێوە ئەچوو ئەوە چاکەکە دوای ناڕەحەتی بە دەست دێت.

# ( ژ )

١-**زەوی ویـران:** ئـەو بـە زەوی ویـرانەوەی مانـای پەشیمانی و ترسناکی‌یە وە دەڵێن ڕەمزە بۆ ئافرەتی وشك و سەرسەخت.

٢-**زەوی دیاری کراو بە چاو:** زەوی‌یەکی دیاری کراو بە چاو ڕەمزە بۆ ئافرەت.

٣-**زەویی فراوانی نەزانراو:** خەو بە زەوی فراوانی نەزانراوەوە بەڵگەیە لەسەر دنیا.

٤-**زەویی فراوانی سەوز:** خەو بە زەوی‌یەکی فراوانەوە کە سەوزایی تێدا بێت ڕەمزە بۆ ئایین.

٥-**زەوی بێ کەڵك:** خەو بە زەوی‌یەکی بێ کەڵکەوە سەرپێچی‌یە لە ئایین.

٦-**زەویـی کشتوکاڵی:** ئـەوەی لـە خـەودا بینی زەوی‌یەکی چێنراوی بە پیتی هەیەو کشتوکاڵەکەشی جوانە، ئەوە ژنێکی جوان ئەهێنێ.

٧-**زەویـی وشك و ڕووت:** ئـەوەی بینی خاوەنی زەوی‌یەکی وشك و ڕووتەنە ئەوە ژنێکی هەژاری نەزۆك ئەهێنێ.

٨-**زەمین لەرزە:** زەمین لەرزەلە خەودا نیشانەیە لەسەر تێکچوونی دەروونی و گرنگیی گوران.

٩-**زەنـگ:** خـەو بیـنین بـە زەنگەوە نیشانەیە لەسەر بیستنی هەواڵێك لە لایەنێکی ڕەسمی‌یـەوە.. وە دەڵـێن خەو بە زەنگی پچڕ پچڕەوە نیشانەیە لەسەر هەواڵی چاکە، وە خەو بە زەنگی بەردەوامەوە نیشانەیە لەسەر هەواڵی ناخۆش.. ئەگەر زەنگەکە دڵخۆشکەر بوو ئەوە هەواڵەکە دڵخۆشکەرە.

**١٠-زیان:** زیان لە خەودا نیشانەیە لەسەر گوناهو ناپاکی.

**١١-زەمزەم:** ئەوەی لە خەودا بینی کە لە ئاوی زەمزەم ئەخواتەوە ئەو نیشانەی چاك بوونەوەیەتی لە نەخۆشی و دەردەسەری، بە تایبەتی خواردنەوەی بۆ شتێکی تایبەتی پێی ئەگات.

**١٢-زەکات:** زەکات لە خەودا نیشانەیە لەسەر زیادبوونی سامان بە دوو ئەوەندە، ئەوەی بینی زەکات ئەدات، نیشانەی گەشە سەندنی سامانەکەی و زیادبوونیەتی لەو ساڵەدا، ئەوەی بینی زەکات جیا ئەکاتەوە خوای گەورە کارەکانی ئاسان ئەکات، ئەوەی سەر فیترە (زکاة الفطر)ی لە خەودا بەجێ هێنا نیشانەی زۆر نوێژی و تەسبیحات و بەجێ هێنانی فەرزەکانیەتی ئەگەر قەرزار بێ، وە لەو حاڵەدا نەخۆشی تووشی نابێت، ئەوەی بینی زەکاتی ماڵ ئەدات، ئەوەنیشانەیە لەسەر خێرو پاراستن لە دوژمنان.

**١٣-زەیتوون:** زەیتوونی رەش لە خەودا رۆزی و سامانە، زەیتوونی زەرد غەم و ناڕەحەتی و نەخۆشییە، وە درەختی زەیتون پیاوێکی سوودمەندە بۆ کەس و کاری، وە ئەڵێن ئافرەتێکی چاکە، وە گەڵای زەیتوون لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئاشتی و رێکڕەوی (إستقامة)، وە بەرەکەی نیشانەیە لەسەر رۆزیی ئاسان و بەختەوەریی تەواو، وە زەیتوون بۆ نەخۆش لە خەویاندا نیشانەیە لەسەر هێزیان و بەرەکەی و گەڵاکەی نیشانەیە لەسەر رزگاربوونیان لەو نەخۆشییە.

**١٤-زۆریی:** هەموو زیاد بوونێ لە لاشەو باڵاو زمان و ریش و دەست و قاچ پێزەو زیاد بوونێکی چاکە، وە هەموو زیاد بوونێکی لە رادە بەدەر بێز لێ کراوەو ئازاوەو ریسواییە.

**١٥-زینا:** زینا لە خەودا دزی و ناپاکییە، ئەوەی بینی لە خەودا زینا ئەکات ئەوە ناپاکی و دزی ئەکات.

**١٦-زەردەواڵە:** زەردەواڵە لە خەودا نیشانەیە لەسەر بوونی دوژمنی نهێنی کە لە ریسواییدا تەنگت پێ هەڵئەچنێ.

**١٧-زەعفەران:** زەعفەران لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاهەڵدان و باشە، ئەگەر ڕەنگەکەی کاری لەسەر لاشە نەکردبوو یان پۆشاك چونکە لە پیرۆزەکانە، ئەگەر ڕەنگەکەی کاری خۆی کردبوو ئەوە نەخۆشی‌یە بۆ بینەرەکە.. وە هاڕینی زەعفەران لە خەودا نەخۆشی‌یە.

**١٨-زنجیر:** ئەگەر خۆتت بینی یان کەسێکی تر بەسترابووەوە بە زنجیر، ئەوە نیشانەی ئەوەیە تۆ بە ناڕەوا تاوانبار کراوی، ئەگەر خۆتت بینی زنجیرەکەت کردەوە یان پچڕا ئەوە هەموو شتێ کۆتایی دێت و ڕاستیش ئاشکرا نەبێت.

**١٩-زەمق:** خەوت بە زەمقەوە نیشانەی ئەوەیە سامانێکت دەست ئەکەوێ.

**٢٠-زیان:** زیان لێ کەوتن لەخەدا نیشانەی نەخۆشی‌یە، وە نیشانەیە لەسەر خراپی کاروبارو ئاشکرابوونی نهێنی.

**٢١-زەرف:** زەرف لە خەودا نیشانەیە لەسەر قاپ، دەڵێن نیشانەیە لەسەر مانای جوان.

**٢٢-زانا:** بینینی زانایان و دانایان و فەیلەسوفان لە خەودا مژدەیە بە بەرزیی چارەنووس و پلەو پایەو زانایی بۆ خەو بینەکە، وە بینینی پیاوچاکان چاکی‌یە لە ئایینەکەیدا.

**٢٣-زیو:** زیو لە خەودا سامان و ڕۆزی و بەخششە، وە دراوی زیوی ڕەمزە بۆ سەرکەوتن و ڕۆزیی باش، وە قاپ و قاپاغی زیو ئیشی چاکەیە.

**٢٤-زیرە:** زیرە لە خەودا نیشانەیە لەسەر ڕۆزیی حەڵاڵ.

**٢٥-زەلکاو:** خەو بە زەلکاوەوە یان زەوی‌یە خۆری بەربکەوێ خەوێکی چاکە، بەڵام ئەگەر ڕەشەبا زۆری هێنا ئەوە نارەحەتی لە ڕێدایە.

**٢٦-زۆرانبازی سەگێکی زەبەلاح:** زۆرانبازیی سەگێکی گەورە لە خەودا زیادبوونی هاوڕێیانە.

**٢٧-زنجیرە:** خەوت بەوەوە کە زنجیرەیەکت پێ‌یە مانای پچڕانی پەیوەندی‌یەکانی نێوان تۆو خۆشەویستەکەتە.

# ( ژ )

**١-ژووری رووناك:** ژووری رووناك لە خەودا نیشانەیە لەسەر هیوای چاك و ئاواتی بەختیار کە تا ئێستا بەسترابووەوە، وە ئەڵێن نیشانەیە لەسەر مژدە بە زانستی بەسوود یان کوڕی ڕەوانبێژ بۆ خاوەن ژوور.

**٢-ژووری داخراو:** خەو بینینت بە ژوورێکی داخراوەوە نیشانەیە بۆ ئەو تەنگی و بێزارییەی تووشی بوویت.

**٣-ژووری تاریك:** خەو بینینت بە ژووری تاریکەوە مانای زۆری بێ تاقەتییە بۆ نەتوانینی چارەی گرفتەکان.

**٤-ژوور:** ژوور لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئاسایش و دوا ڕۆژی باش، ئەوەی خۆیی لە ژوورێکدا بینییەوە، ئەگەر ژوورەکە نەزانراو بوو یان نامۆ ئەوە بەرزترین ئاواتی بەخێرایی بە دەست ئەهێنێ، بە تایبەتی ئەگەر ژوورەکە فراوان بێت.. بەڵام ئەگەر ژوورەکە تەنگ بێت کە مانەوە تیایدا ناڕەحەت بێت ئەوا ئاواتەکانی بە هێواشی دێتە دی، وە ئەگەر ژوورەکە ناسراو بێت ئەوە بە پێی بینینەکەیە، ئەگەر کەسێکی تێدا بینی خۆشی ئەویست، ئەوە لەو حاڵەدا ئاگادارییەکی گەورەیە لەوەی کە ئەو خۆشەویستە ئەیڵێ.

**٥-ژماردن:** ئەگەر خەوت بینی ئەژمێری ئەوە بەختێکی باشە، ئەگەر ناڕەحەتیت هەبێ ئەوە کۆتایی پێ دێت، یا ئەو ناڕەحەتییەش کاتی بێت.

**٦-ژمارە پێنج:** ژمارە پێنج لە خەودا نیشانەی ئێرەیی پێ بردنە.

**٧-ژماره حەوت:** ژماره حەوت لە خەودا نیشانەیە لەسەر کاتەکان و رۆژەکان و ساڵەکان و نیشانەی سەرکەوتنە.

**٨-ژن:** ئەگەر پیاوێکی عازەبت بینی لەگەڵ ئافرەتێکدا ئەڕۆی کە ژنی بوو ئەوە هەواڵێ ئەبیستی چاوەڕوان نەکراوە.

**٩-ژەمی خواردن:** دروست کردنی ژەمی خواردن لە خەودا نیشانەیە لەسەر روودانی هەواڵی خۆش، بەڵام خواردنی لە خەودا نیشانەیەکی خراپە.

**١٠-ژەهر:** ژەهر لە خەودا نیشانەیە لەسەر زینا.

**١١-ژێر خان:** ژێرخان لە خەودا مانای شەرمەزارییە لە هەندێ هەڵسوکەوت.

# ( س )

**١-سەرکردە:** بینینی سەرکردە لە خەودا دەستکەوتێکی گەورەیە بۆ بینەر، وە چاکەیەکی گەورە چاوەڕوانی ئەکات، ئەگەر سەرکردەکە رازی و بە خەندە بوو بۆ ئەو.

**٢-سەرکەوتن بەسەر پلیکانەدا:** سەرکەوتن بەسەر پلیکانەدا بەڵگەیە لەسەر حاوسەرایەتیەکی بەختیارو ژیانێکی ئاشتی و ئاسوودە.

**٣-سەرما:** سەرما لە وەرزی بەهاردا هەژاریيە، وە لە وەرزی هاویندا رۆزیيە، وە رەشەبای سارد نیشانەی ناخۆشیيە، وە تەواو بوونی رەشەباو نەمانی هەور نەمانی ئەو ناخۆشی‌یەیە.

**٤-سك:** سکی مرۆڤ لە خەودا نیشانەیە لەسەر خەزێنەی پارەکەی.

**٥-سێو:** سێو لە خەودا هەوڵی پیاوە، ئیشەکەی و هیوای و هەوڵەکانی، وە هەوڵەکەی شیرین و چاکە وەکو سێو، هەڵگرتن و خواردن و بوون بە خاوەنی سێو لە خەودا نیشانەیە لەسەر دەسگیر بوونی تواناو ئیش و هیوا بە رادەی خواردن و خواستن و خاوەنداریێتی ئەو سێوە.

**٦-ساڵنامە:** ساڵنامە لە خەودا نشانەیە بۆ گۆڕانی بەختمان، وە وا دەبێ ماناکەی ئەو بەختیاری‌یەی چاوەڕوانی ئەکەی بە دەستی ئەهێنی، هەرچەندەش زۆر درێژە ناکێشێ.

**٧-سوپاسگوزاری:** سوپاس کردنی خوا لە خەودا نیشانەیە لەسەر چاکە زۆریی، ئەوەی بینی سوپاسی خوای گەورە ئەکا، ئەوە رووناکی و رێنمایی‌یە لە ئایینەکەیدا بە دەستی ئەهێنێ.

٨-**سزادان:** ئەگـەر خـەوت بـە سـزادانەوە بـینی، نیشانەیە لەسەر تووش بوونت بە نارەحـەتی ، وە ئەگـەر خەوت بە سزادانی کەسێکەوە بینی نیشانەیە لەسەر بەدی هاتنی داواکارییەکانت دوای هەوڵدانێکی گەورە.

٩-**سامان:** خەوی سامان بۆ هەژار نیشانەیە لەسەر داپۆشین، وە بۆ دەوڵەمەند لەسەر بەرز بوونەوەی پلەو پایەی، وە بۆ نەخۆش نیشانەی چاك بوونەوەیە، وە بۆ عازەب نیشانەی ەووت بوونـە، وە بـۆ سـەفەرکەر گەشـتن بـە مورادەکەیـەتی، وە خەو بینین بە سامانی ەاوڕێکانـت نیشانەی ئەوەیە داوای یارمەتییان لـێ ئەکەی.. ئەگەر خەوت بینی بووی بە ەاوەنی سامانێك یان پارەیەك ئەوە ناخۆشییەك بەم نزیکانە چاوەڕوانتە.

١٠-**سەهۆڵ:** سـەهۆڵ لـە خـەودا نیشـانەیە لەسـەر بەخت باشی و چاك بوونەوە لە ەخۆشـی، ئەگـەر ئـەو کەسە خۆی پێ ئەشۆرد، وە خواردنی سەهۆڵ لە خەودا نیشانەیە لەسـەر هـەوڵدان بـە شـوێن سـامانێکەوە، وە ئەگـەر سـەهۆڵەکە پـیس بـوو نیشانەی نارەحەتییـە بـۆ ئـەو کەسـەی ئـەیخوات.. بەڵام ئەگەر سەهۆڵت بینی یان شکاندت ئەوە ىشـانەیەکی چـاکە، چـونکە ئەگـەر ژنـت نەهێـنابێ ئـەوە سـەرکەوتوو ئەبیـت لە ژن ەـنانەکەتدا کاتـێ تـەواو ئەبێ.. ئەگەر خەوت بینی لەسەر سەهۆڵ خلیسکێن ئەکەی، ئـەوە ئاگادارییـە بـۆت کە باشترین ئاواتت لە ترسناکی و ئەنجام نەهاتندایە، یان ئەگەر بـیت بـە باشـی خلیسـکێنەکە ئەکەیـت و سەهۆڵەکەش ڕەونەق دارو ئاسان بوو، ئەوە داڕاندنەکە کۆتایی دێت و سەرئەکەویت.

١١-**سیر:** خواردنـی سیر بـە لێنراوی لە خەودا نیشانەی تۆبە کردنە لە تاوانێك.. وە خواردنـی سـیری کـاڵ نیشـانەیە لەسەر خواردنی ماڵێکی پیس، وە بۆ نەخۆش نیشانەی ەرو چاك بوونەوەیە.

١٢-**سـەرباز:** بینـینی سـەرباز لە خەودا نیشانەی ناخۆشییە.. ئەوەی سەربازی بینی ئەوە شـتێك لـە پـارە یان خۆشەویستی یان مەسەلەیەك گوم ئەکات.. وە نزیك بوونەوەی سەرباز لـە خەو بینەوە نیشانەیە لەسەر نزیك بوونەوەی ناخۆشی لـێیەوە، وە ڕەت بوونی سەرباز بە لایدا نیشانەیە لەسەر ڕەت بوونی ناخۆشی و ڕۆشتنی بە خێرایی.

**١٣-سەرتاشین:** ئەوەی بینی قژی سەری تاشراوە یان سەری ئەتاشێ نیشانەیە لەسەر خەفەت و نەخۆشی، وە تاشینی چەناگە لە خەوداناڕێکی رۆزییە یان رووداني نارەحەتییە، ئەگەر بینیت کەسێکی تر سەر ئەتاشێ ئەوە ئاگادارییە بە هەواڵی ناخۆش.. ئەوەی دڵخۆش بوو بە سەرتاشینە جوانەکەی لە خەودا مانای وایە سامانەکەی لە پەرستشدا خەرج دەکات.. وە ئەڵێن سەرتاشین نیشانەی جوانکارییە بۆ پیاو لە دنیایداو پاك و خاوێنییە لە رەوشتیدا.

**١٤-سەرتاش:** سەرتاش لە خەودا ئاگادارییە، هەرچەندە ئەو ئاگادارمان ئەکات کە سەرکەوتنێك لە ئارادایە کەمێ دوا ئەکەوێ و دوای تێکۆشان پێمان ئەگات.

**١٥-سوێند:** سوێندی راست لە خەودا دەروازەو ئەمانەتە.. وە سوێندی درۆ دواکەوتن و پەشیمانی و هێواشییە لە چاوخەڵکیدا.

**١٦-سوێندی تەلاق:** سوێندی تەلاق لە خەودا بۆ خاوەن هاوسەر نیشانەیە لەسەر رازیی بوون بە گوزەرانی ئێستای، وە بۆ کەسێ هاوسەری نەبێ نیشانەیە لەسەر خراپی گوزەرانی.

**١٧-سووتان:** ئەگەر خەوت بینی تووشی سووتان بوویت، ئەوە سامانێکی گەورەت بەم زوانە دەست گیر ئەبێ، وە ئەگەر خەوت بە خانوویەکەوە بینی ئەسووتا ئەوە نیشانەی سەرکەوتنە لە کاروباری ساماندا.

**١٨-سروشتی پۆشاك:** کڕینی لە خەودا هەژارییەو لەبەرکردنی ئاشکرا کردنی گوزەرانەو فرۆشتنی نەمانی هەژارییە.

**١٩-سرکە:** ئەگەر لە خەودا سرکەت ئەخوارد ئاگادارییە کە تووشی نەخۆشییەکی ئاسان ئەبیت لە ماوەی نزیکەی دوو رۆژدا، بە مەرجێ ئەوەی کە خواردتەوە کەم بووبێ، بەڵام ئەگەر زۆر بووبێ ئەوە نەخۆشییەکە درێژە ئەکێشێ، وە خەو بینین بە کەسێکەوە کە سرکە ئەکڕێ یان ئەیفرۆشێ، یان خەڵکی سەودای لەسەر ئەکەن، نیشانەی ئەوەیە کە تۆ چەند هەواڵێ ئەبیستی کە هەموویان دڵخۆشکەر نین.

**٢٠-سەوزی:** سەوزەمەنی هەمووی لە خەودا چاکە، هەمووی رۆزی و چاك بوونەوەیە.

٢١-**سەربڕین**: سەربڕین لە خەودا تاوان و سزایە، ئەوەی بینی مرۆڤێکی سەربڕیوە ئەوە زوڵمی لێ ئەکات.. ئەوەی بینی خۆی سەربڕرا بوو با پەنا بەخوا بگرێت، ئەوەی چەند کەسێکی سەربڕاوی بینی ئەوە نیشانەی بەڵگەی خێرە بۆ خەو بینەکە بە تەواوی ئەو کارانە ئەیەوێ.

٢٢-**سەربڕینی بێچوو**: سەربڕینی بێچوو لە خەودا نیشانەیە لەسەر مردنی نزیکێك.

٢٣-**سەربڕینی بەران**: سەربڕینی بەران لە خەودا وێنەیەکە بۆ نەمانی دەروون.

٢٤-**سەربڕینی بەرخ**: ئەوەی بینی بەرخێکی سەربڕیوە، منداڵێکی ئەمرێ یان هی کەسێکی نزیکی ئەمرێ.

٢٥-**سوار بوونی فڕۆکە**: سواربوونی فڕۆکە لە خەودا نیشانەی بەرز بوونەوەو پایە بەرزی‌یە.

٢٦-**سوار بوونی ئۆتۆمبێل**: سوار بوونی ئۆتۆمبێل لە خەودا مانای گۆڕان و گوێزانەوەو سەرکەوتنە.

٢٧-**سوار بوونی شەمەندەفەر**: سوار بوونی شەمەندەفەر لە خەودا نیشانەی تەنگ و چەڵەمەیە یان کارەساتێکە لە ژیانتدا کە چارەکردنی چاوەڕوانکراوە.

٢٨-**سوار بوونی ماتۆڕ**: سوار بوونی ماتۆڕ لە خەودا مانای سەرکەوتنە لە ئیش و ماڵدا.

٢٩-**سواربوونی پاسکیل**: سواربوونی پاسکیل لە خەودا نیشانەیە لەسەر پەلە کردن و نارەحەتی.

٣٠-**سوار بوونی گوێ درێژ**: سوار بوونی گوێ درێژ لە خەودا نیشانەی نەمانی نارەحەتی‌یە.

٣١-**سواربوونی ئەسپ**: سواربوونی ئەسپ لە خەودا نیشانەی سەرکەوتنی خێرای چاوەڕوانکراوە.

٣٢-**سواربوونی بەلەم**: سواربوونی بەلەم لە خەودا مانای سەرکەوتنە لە کارو خۆشەویستی‌دا.

٣٣-**سواربوونی کەشتی:** سواربوونی کەشتی لە خەوندا نیشانەی رزگار بوونە.

٣٤-**سەر:** خەو بینین بە سەرتەوە کە زۆر زلە لە نیشانەی سەرکەوتنە.. ئەگەر سەری کەسێکی تر گەورە بوو ئەوە هەواڵێکی خۆشی لێوە ئەبیستی.

٣٥-**سەما:** سەما لە خەودا نەگبەتی‌یە، ئەودی بۆ کەسێکی تر سەما بکات ئەوە بەشداری ئەکات لەو نەگبەتی‌یەیدا، ئەوەی لە ماڵی خۆیدا بە تەنیا سەما بکات، ئەوە نشانەیە لەسەر دڵخۆشی و خۆش گوزەرانی.. ئەگەر نەخۆش سەمای کرد ئەوە دڵە راوکێی زیاد ئەکات.. ئەوەی راکێشرا بۆ سەما ئەوە رزگار بوونیەتی لە نارەحەتی.

٣٦-**سەردانی گۆری پێغەمبەرﷺ:** سەردانی گۆری پێغەمبەرﷺ لە خەودا نیشانەی ئاشتی و نزیك بوونەوەیە لە خوای گەورە بە ئیشی چاکە.. وە هەروەها نیشانەیە لەسەر ئاسایش لە ترس و پایە بەرزی و داوا کردنە لە خواو پیاوچاکان و پایەدارانی ئال و بەیت.

٣٧-**سەردانی بیت المقدس:** زیارەتی بیت المقدس لە خەودا نیشانەیە لەسەر خێرو گەران بە دوای زانست و نهێنی‌یە سەرسورهێنەرەکاندا.

٣٨-**سەردانی ئال و بەیت:** زیارەتی ئال و بەیت لە خەودا مانای بانگ کردنی تۆیە بۆ سەردانیان.

٣٩-**سەردان:** سەردانی خزم یان هاورێ لە خەودا نیشانەی خۆشەویستی و بەزەیی و سۆزە.

٤٠-**سلاوی بەخێر هاتن:** ئەوەی لە خەودا سلاوی لە یەکێ کرد بە مەبەستی بەخێر هاتن نیشانەی ئاسایش و خێرە.

٤١-**سلاوی نوێژ:** دەرچوون لە نوێژ دوای تەواو بوونی بە سلاودانەوە، دەرچوونە لە هەموو غەمێك.

٤٢-**سەبەتە:** سەبەتە لە خەودا رەمزە بۆ مژدەو ئاگاداریی، ئەگەر ئەوەی تیا بینرا دڵ ئەیگرت ئەوە مژدەیە، ئەگەر ئەوەی تیا بینرا دڵ نەینەگرت ئەوە ئاگاداری‌یە.

٤٣-**سەرکەوتنە سەرەوە:** سەرکەوتنە سەرەوە لە خەودا نیشانەیە بۆ بەرزبوونەوەو بەرزایی.. سەرکەوتن بە پلیکانەدا رزگار بوونە، سەرکەوتنی شاخ پلەو پایەی بەرزە،

سـەرکەوتن بەسـەر درەختدا هێزو چاکەیە، سەرکەوتن بەسەر رووداو جووت بوونە، ئەگەر یـەکێ سـەرکەوتنەکەی کۆتـایی هـات بـە قـەد بەرزاییەکـە ئـەوە ئـەبێ بە بنکەی، دابەزینیش دۆران و زیان و فەوتانە، دۆراندنەکە بە ئاستی دابەزینەکەیەتی.

٤٤-**سەرنێشە**: ئەگـەر لـە خەودا سەرت دەئێشا، ئەوە بزانە بەدبەختیت تووش ئەبێ لەسەر کارەکەت، وە نارەحەتیە لە کارەکەتدا.

٤٥-**سـابوون**: سـابوون لـە خـەودا نیشـانەی سـامانە، وە شـۆردن بـە سابوون چاك بوونەوەیە لە نەخۆشی و تاوان و غەم رەواندنەوەیە.

٤٦-**سـندوق**: سـندوق لـە خـەودا نیشانەیە لەسەر خانوو ژن و دوکان و عەمبار، وە سندوقی قفڵ دراو نیشانەیە لەسەر پیاو، کۆمەڵە سندوقێکی قفڵ دراو نیشانەیە لەسەر کۆمەڵـە پـیاوێ و لەسـەر دادگەریش، ئەوەی بینرا لە سندوقدایە یان هاتە دەرەوە لـێی یـان چـووە نـاوی لە چاکە یان خراپە نیشانەیە لەسەر جەوهەری رووداوەکە لە چاکە یان خراپە.

٤٧-**سـێبەر**: سێبەر لە خەودا بریتیە لە حەسانەوەو سوودو جێگای سێبەر ئەگەر لە هاویـندا بوو، وە دائەنرێ بە غەم و بەدبەختی ئەگەر لە زستاندا بوو، وە نیشانەیە لەسەر دەسـەڵاتدار چـونکە سـێبەری خراپـە لـە زەویـدا، ئەوەی بینی بەرەو سێبەرێك ئەچوو بۆ حەسـانەوە لەژێـریدا لـە گـەرمایی ئەوە لە غەم رزگاری ئەبێ و رۆزیی دەسگیر ئەبێ، وە سـێبەری ئافـرەت مـێردەکەیەتی، وە ئافرەتی شوو نەکردبوو ئەگەر بەرەو سێبەر رۆیشت لەوە پیاوێك مارەی ئەکات لە خاوەنی پلەو پایەیە.

٤٨-**سەرزەنشت**: ئەگەر سەرزەنشت کرای لە لایەن هاوڕێیەکەوە نیشانەی گەڕانەوەیە بـۆ ئـەو شـتەی لەسەری بووی، ئەگەر خەو بینەکە سـەرزەنشتی خۆی ئەکرد ئەوە ئیشێك ئەکات کە پەشیمانی بە دواوەیە.

٤٩-**سەرکەوتن**: سەرکەوتوو لە خەودا ژێرکەوتووە، ژێرکەوتووش سەرکەوتووە.

٥٠-**سەرکوت کردن**: لە لێکدانەوەدا نیشانەیە لەسەر خێرو ئیشی چاکە.

٥١-**سەگ:** سەگی راو یان تانجی لە خەودا نیشانەی سەرکەوتنە دوای هەوڵێکی گەورە.

٥٢-**سفرە:** سفرە لە خەودا رۆزی و وەڵامی بانگهێشتن وخۆش گوزەرانی‌یە، وە نیشانەی سەرکەوتنە بەسەر دوژمندا، ئەگەر خەوت بینی بە سفرەیەکەوە خواردنی لەسەر بوو نیشانەیە لەسەر ئەوەی بەختێکی ئاسوودە چاوەڕوانتە لە بارەی خۆش گوزەرانی‌یەوە، ئەگەر خۆت سفرەت رێك ئەخست نیشانەیە لەسەر زۆریی کارە خێرەکانت و زۆریی پیاوەتیت و خۆشەویستیت بۆ براکانت، وە دەڵێن ئەگەر لەگەڵ چەند هاورێ‌یەکدا بوویت و خواردنتان بە ئاسوودەیی‌یەوە دەخواردو کەسانی ترت بینی نان ئەخۆن ئەوە بەختە باشەکەت پاش ماوەیەك بەدی دێت، وە ئەگەر هەوڵتدا خواردن بخۆی لەگەڵیانداو بێ سوود بوو هەوڵەکەت، ئەوە بەرامبەرەکەت خۆشەویستەکەت لە دەست ئەسێنێ، وە بینینی کورسی خاڵی بە نارێك و پێکی بانگهێشتنەکە بەرەو کۆتایی ئەچوو ئەوە نیشانەی دڕانە.

٥٣-**ساردەمەنی‌یەکان:** خەو بە خواردنی ساردەمەنی‌یەکانەوە نیشانەی ئاسوودەیی‌یە لە دوا رۆژدا، بەڵام ئەگەر منالان ساردەمەنییان ئەخوارد ئەوە نیشانەیە لەسەر قازانجی پارە.

٥٤-**سەربازگە:** ئەگەر لە خەودا لە سەربازگە بوویت ئەوە نیشانەی گۆڕانکاری‌یە، وە بینینی سەربازگە بەڵێنە بە سەرکەوتن.

٥٥-**سامان:** ئەگەر لە خەودا سامانێکت دەستگیر بوو خەوێکی بەشەو یان پارە بە کەسێك ئەدەیت و خۆشت دڵشادی، خەو بە ون بوونی سامانەوە نیشانەی دۆڕانەو ئەوەی تۆی خۆش ئەوێ راستگۆ نی‌یە، یان هاورێکەت دەست پاك نی‌یە، وە خەو بە قەرزکردنی پارەوە باش نی‌یە بە تایبەتی ئەگەر قەرزاری بیت، یان ئەتەوێ پارەی لێ قەرز بکەیت.

٥٦-**سەرزەنشت کردن:** خەوت بە غەیبەت کردنی کەسێکەوە نیشانەیەکی باشە بۆ هەواڵێکی داهاتوو، بەڵام ئەگەر کەسێکی تر غەیبەتی تۆی ئەکرد ئەوە ئاگاداری‌یە لە ناڕەحەتی ئاسان.



۱-**شێر:** شێر لە خەودا دەسەڵاتە، ئەگەر بینیت ئەوە تووشی گەشەو سەرکەوتن لەبیت لە ئیشەکانتدا یان شتێکی نوێ هەیە لە خۆشەویستی‌یەکەتدا، ئەگەر ئەو شێرەی بینیوتە لە تەندروستی‌یەکی باشدا بوو، وە ئەگەر شێرەکە مردوو بوو یان نەخۆش بوو ئەوە بەڵگەی دۆڕاندنە، وە خەو بینین بە سوار بوونی شێرەوە بەڵگەیە بۆ سوار بوونی ناڕەحەتی لە کاروباردا، وە خەو بینین بە شێری مێینەوە چاکترە لە خەو بە شێری نێرینەوە، بەڵام خەو بە بەچکە شێرەوە یاری بکات لە بەردەمتا ئەوە پەیوەندی هاوڕێ‌یەکی نوێ‌یە، وە دەڵێن سولتانێکی زاڵمی دەسەڵاتدارە. وە دەڵێن دوژمنێکی دەسەڵاتدارە، ئەوەی شێرەکەی بینی و ئەیترساند ئەوە نەخۆش ئەکەوێت یان بەند ئەبێت، وە ئەوەی بینی لە شێر را ئەکات ئەوە رزگاری ئەبێت لەوەی لێی ئەترسێ و تووشی زانایی و دانایی لەبێت.

۲-**شەپۆل:** خەو بینین بە دەریایەکی شەپۆلاوی‌یەوە نیشانەی ناڕەحەتی‌یە لە خۆشەویستیدا یان لە ئیشدا با تۆ لە ناویشیدا بیت یان لە قەراخیدا شەپۆلەکان بەرەنگارت بن.

۳-**شەل:** خەو بینینت بە پیاوێکی شەلەوە بەڵگەی ئەوەیە فێڵت لێ ئەکات، وە ئەگەر خۆت لە خەودا شەل بوویت یان نەخۆشی‌یەکت هەیە لە قاچتا ئەوە نیشانەی فێڵ کردنە لێت، ئەوە لە حاڵەتێکی دژواردایت و ئەتەوێ رزگارت بێت، ئەگەر بینیت قاچێکی تەختەت هەیە بەڵگەی جەنجاڵی‌یەکی نوێ‌یە بۆت، وە ئەگەر بینیت یان گوێت لێ بوو لە یەکێ قاچی تەختەی هەیە یان شەلە ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ هەواڵی ناخۆش.

٤-**شـایەتومان:** ئەوەی لە خەودا بینی دانیشتووە لە نوێژدایەو شایەتومان دەڵێ،ئەوە خوای گەورە ناخۆشی لەسەر لائەبات و پێویستی‌یەکانی دەستەبەر ئەکات.

٥-**شادومانی:** شـادومانی مرۆڤ لە خەودا نیشانەی مژدەو رزگار بوونە، وە ئەگەر خەو بینەکە لە نارەحەتیدا بێت ئەوە خوا رزگاری ئەکات.

٦-**شـایەتی دان:** شـایەتی دان بـە راستیی و بێ درۆ لە خەدا بەڵگەی بە وەفایی‌یە، شاردنەوەی شایەتی لە خەودا بەڵگەی تەماح و دڵ پیسی و حەز بە تاوان کردنە.

٧-**شاخ:** بینینی شاخی بەرز لە خەودا نیشانەیە لەسەر هیوای بڵندو کۆ ئەبێتەوە لە دەروونـی خەو بینەکەدا، وە هەڵبەزین بە شاخدا نیشانەیە لەسەر ئەو چاوەڕوانی‌یەی خەو بیـنەکە بەرامبەر بە سەرکەوتن ئەیکات، ئەگەر لە خەدا کەسێکی ترت بینی بە شاخدا هەڵـئەبەزی ئـەوە هەواڵی خۆش ئەبیستی، وە ئەگەر لە خەودا شاخی بەرزی سپیت بینی مانای وایە چواردەورت هێمن و بەختیارە، شاخی زەرد نیشانەیە لەسەر ئەوەی کە گوزەران ناسـایی‌یە، وە شـاخی گـۆڕراو مانای وایە گوزەران گۆڕراوە، وە شاخی سەخت مانای وایە گوزەران سەخت و نارەحەتە.

٨-**شێتی:** شێتی لە خەودا نیشانەی بەختیاری‌یەکی درێژی هێمنانەیە، وە پەل کوتانی خەوبین نیشانەیە لەسەر نارێکی خۆی.

٩-**شورە:** ئەگەر خۆتت بینی بە شورا دەورت گیرابوو ئەوە تاوانێکت لە لایەن کەسانی تـرەوە تاراسـتە ئەکرێ، ئەگەر کەسانی ترت بینی لەناو شورادا ئەوە نزیکێك پاکیەکەت نیشان ئەدا بەرامبەر بەو تاوانەی داویانەتە پاڵت.

١٠-**شووشـە:** بینـینی شووشە لە خەودا ئەگەر ساغ بوو نیشانەی دەرچوون و گوزەران باشی‌یە وە بینینی شکاوەکەی نیشانەی دۆڕاندنە.

١١-**شووشـەی زۆر:** شووشەکان لە خەودا ئەگەر خاوێن بوون و پڕ بوون لە شلەی روون ئەوە خەوەکە خۆشەو ئاگاداری‌یە بۆ دەستکەوت، بەڵام ئەگەر شووشەکان شکا بوون، ئەوە نیشانەی دوژمنە، ئەگەر خەوت بینی بە شووشەی دەرمانەوە، ئەوە لە بارەی نەخۆشێکەوە یان نەخۆشەوە شتێك ئەبیستی.

**١٢-شایی:** خەو بە شایی‌یەوە لە هۆڵ یان شوێنێکی گەورە لە نێوان خەڵکێکی زۆری بانگ کراودا وە زاوات لە پالدا بێ یان بووك نیشانەیە لەسەر چاوەڕوانی ڕووداوێکت کۆمەڵایەتی و پەیوەندی‌یەکی سەرکەوتووانە.

**١٣-شەکر:** شەکر لە خەودا نیشانەی فێڵ و ساختەکاری‌یە، دەڵێن خواردنی شەکر یان بینینی یان بوون بە خاوەنی لە خەودا نیشانەی دڵخۆشی و چاك بوونەوەیە لە نەخۆشی و نەمانی غەم وخەفەت و گەیشتن بە ئاواتە، شەکری ڕووەکی نیشانەی دڵپاکی‌یە لە گوفتارو کرداردا.

**١٤-شەقام:** بینینی شەقام لە خەودا نیشانەی گواستنەوەتە لە خانوویەکەوە بە خانوویەکی تر، وە ڕۆشتننت بە شەقامدا نیشانەیە لەسەر ڕێبازی ژیانت، ڕۆشتننت بە شەقامی فراوان و ڕێکدا مانای ئەوەیە لە ژیانتدا ڕێك و ڕاست و بەختەوەری، وە ڕۆشتننت بە شەقامێکی تەسکدا مانای بوونی ماوەیەکە لە تەنگەتاوی و دڵە ڕاوکێ و ناڕەحەتی.

**١٥-شەیتان:** بینینی شەیتان لە خەودا ئاگاداری‌یە لە ترسناکی یان کێ بەرکێ کەرێك کە سەرئەکەویت بەسەریدا.

**١٦-شەترەنج:** شەترەنج لەخەودا نیشانەیە لەسەر هۆشی گونجاوو ساغ.

**١٧-شیرینی، شکۆلاتە:** خواردنی شکۆلاتە ڕازی بوون و قایل بوونە، خواردنەوەی شیرینی نیشانەیە بۆ سامانێکی چاوەڕوانکراو.

**١٨-شووتی ئاگادارکردنەوە:** شووتی ئاگادارکردنەوە لە خەودا نیشانەی ئاگادارکردنەوەیە لە ناخۆشی یان ناڕەحەتی‌یەك کە نزیکە ڕوودانی.

**١٩-شایی:** شایەتی لە خەودا ئەگەر بە مۆسیقاو ئاوازەوە بوو، ئەوە لەو شوێنەدا کە شایی‌یەکی تێدا ئەکرێ کەسێك ئەمرێ، ئەوەی بینی خۆی بۆ شایی ئامادە ئەکات ئەگەر ژنەکە دیاری کرا ئەوە دنیایەو پێشوازی لێ ئەکا، ئەگەر دیاری نەکرابوو ئەوە نیشانەیە لەسەر مردن.

**٢٠-شین و زار:** شین و زار لە خەودا خۆشی و ئاسوودەیی‌یە، وە بۆ خۆشەویستان جووت بوونە بەم زووانە، وە بۆ کەسانی تر ئاسوودەیی و بەختیاری‌یە.

٢١-**شۆردن:** شۆرین لە خەودا نیشانەیە لەسەر پاکیەتی، ئەگەر لە زستانداو بە ئاوی سارد بوو نیشانەیە لەسەر غەم و نەخۆشی.

٢٢-**شۆردنی دەست:** شۆرینی دەست لە خەودا مانای حەسانەوەیە لە ناڕەحەتی، وە ئەڵێن بەڵگەیە لەسەر بێزاریی لە شتێك، بە تایبەتی ئەگەر شۆرینەکە بە سابوون بوو.

٢٣-**شۆرینی پۆشاك و هەڵخستنی:** شۆرینی پۆشاك لە خەودا مانای ئارەزووە لە رزگار بوون لە هەڵەیەکە کرابێت، وە ئامادەیی بۆ نەمانی هۆکارەکانی ناکۆکی و دڵە راوکێ، وە هەڵخستنی جلی شۆرراو مانای راگەیاندنە لە نەمانی گومانی خراپ و بە هەڵە تێگەیشتن و نەمانی پڕوپاگەندە مەبەست دارەکان.

٢٤-**شانازیی:** شانازیی لە خەودا نیشانەیە بۆ ماڵ و ئاسانی رۆزیی و دەست.

٢٥-**شەبقە:** شەبقەی نوێ نیشانەی بەخت باشی و سەرکەوتنە، وە شەبقەی کۆن نیشانەی نەمانی خۆشەویستی و بەخت خراپی‌یە، ئەگەر لە خەودا شەبقەکەت گوم کردبوو وە بە سەری رووتی ئەگەڕایت ئەوە بەم نزیکانە ژن ئەهێنیت یان هەواڵی ژن هێنان ئەبیستیت، وە ئەگەر شەبقەیەکی پیس یان ناشیرینت لەسەردا بوو ئەوە نیشانەی ناڕەحەتی‌یە لە کاردا یان لە خۆشەویستیدا، بەڵام ئەگەر شەبقەکە خاوێن و گونجاو بێت بۆت ئەوە چاوەڕوانی خۆشی بکە، ئەگەر کەسێکی ترت بینی شەبقەی لەسەر ئەکرد، ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی خۆش بە، ئەگەر سەرت سوڕما بە شەبقەکە یان هەواڵی ناخۆش ئەگەر سوڕنەما بە شەبقەکە.

٢٦-**شەمەندەفەر:** شەمەندەفەر لە خەودا رەمزە بۆ خێرایی و بزواندن و گۆڕان، وە سوار بوونی گۆڕانێکی تێبینی کراوە کە روو بدات لە ژیانی سوار بووەکەدا، وە خۆ بینینەوە لە شەمەندەفەردا مانای تووشی بوونی رووداوێکە.

٢٧-**شکانی قاچ:** شکانی قاچ لە خەودا ئاگاداری‌یەکی خراپە.

٢٨-**شێلم:** شێلم لە خەودا بۆ کەسێ بیبینێ یان بیخوات یان کۆی بکاتەوە یان بیکڕێ یان لێی بنێت رۆزیی‌یەکی گەورەیە.

٢٩-**شار:** ئەگەر لە خەودا لە شارێکی نامۆ خۆت بینییەوە ئەوە گۆڕانکاری‌یەکی گەورەیە.

٣٠-**شانۆ:** شانۆ لە خەودا نیشانەی ماتەمی‌یە بە هۆی گوم بوونی هاوڕێیەکەوە بە تایبەتی ئەگەر خۆت لەسەر شانۆکە بیت و بەخێرهاتنی دانیشتوان بکەیت.

٣١-**شیلان:** خەوەکانی شیلان نیشانەیە لەسەر بەختیاری و بەخت باشی و زۆری سامان.

٣٢-**شانە:** شانە لە لێکدانەوەدا نیشانەیە لەسەر شادی، وە داهێنان بە شانە نیشانەی کاری خێرە، ئەوەی قژی بە شانە داهێنێ ئەوە غەمەکەی نامێنێ و حاڵی باش نەبێ و نازاری لائەچێ و سوودی پێ ئەگات.

٣٣-**شەیپوور، فیقەنە:** ئەگەر لە خەودا فیقەت بینی یان گوێت لە دەنگەکەیەوە بوو، یان بەکارت ئەهێنا ئەمانە هەمووی مانای دۆڕاندنە، وە دەڵێن ئاگاداریی و وریا کردنەوەو ئامادە بوونە.

٣٤-**شکستی، دۆڕان:** ئەوەی بینی لە خەودا شکستی هێناوەو ئەترساو دوژمنی پیا ئەگەشتەوە، ئەوە تووشی غەمێکی ناڕەحەت ئەبێت لە ژیانیدا، ئەوەی بینی لە دوژمنەکەی هەڵهات ئەوە سەرئەکەوێ بەسەریدا.

٣٥-**شەمشەمە کوێرە:** شەمشەمە کوێرە لە خەودا زۆر خراپە، چونکە نەهامەتی بە دواوەیە.

٣٦-**شەراکەت:** خەوی شەریك و شەراکەت نشانەیە لەسەر دڵخۆشی و قازانج وە بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یە، ئەگەر شەریکی کەسێك بیت لەوە دەوڵەمەندتر ئەبیت، وە شەریکی پیاوێکی ناسراو رێك و پێکی و رێزی شەریکانە.

٣٧-**شلە:** شلە لە خەودا هێرشی دوژمنە.

٣٨-**شیرە خۆریی:** خواردنی شیر لە خەودا نیشانەیە لەسەر پێویستیت بە هەندێ دەرمان، ئەگەر لە خەودا شیرت ئەمژی مانای وایە تۆ ئەچیتە ناو وتوێژێکی زۆرەوە بە رادەی ئەو مژینە.

## ( ع )

١-**عەورەتی مرۆڤ:** دەرکەوتنی عەورەتی مرۆڤ نیشانەی ئەوەیە تاوانی ئەکات کە حەیای نەچێ پێی.

## ( غ )

١-**غەم:** خەفەت لە خەودا نیشانەی بەختیارییە، وە ئەگەر کەسێکی ترت بەو شێوەیە بینی یان پۆشاکی رەشی پۆشی بوو ئەوە هەواڵێکی لە دوورەوە پێ ئەگات، ئەوەی بینی هاورێکانی لە تەنگی دان و غەمی خوارد، ئەوە تووشی غەم و ناڕەحەتی ئەبێت. وە دڵتێن غەم لە خەودا نیشانەی عەشقە، ئەوەی بینی غەمبارە ئەوە بە غەمباری و خەفەتەوە بە عەشقەوە ئەتلێتەوە.

# ( ف )

**١-فـرمان:** ئەوەی لە خەودا بینی فرمان بە چاکە ئەکات ئەوە نیشانەی ڕێکەوتنە، وە ئەوەی بینی فرمان بە خراپە ئەکات ئەوە نیشانەی دووبەرەکی‌یە.

**٢-فەریکـە خورما:** فەریکە خورما لە خەودا ڕۆزی‌یە یان نێرراوێکی چاکە، ئەوەی لە خەودا بینی فەریکە خورما ئەخوات ئەوە سوود لە ماڵێکی حەڵاڵ وەرئەگرێ، وە فەریکە خورمای شێدار ماڵێکی نابەردەوامە، وە دەڵێن خێرێکی تەواوە.

**٣-فرۆشتن:** فرۆشتن لە خەودا بەرزی و دەسەڵاتە ئەگەر ئافرەتێك یان پیاوێك بیکڕن و هەژار بن، بەڵام فرۆشتن بە دەوڵەمەندان ئەوە خەوێکی خراپە.

**٤-فڕین بە هەردوو باڵ:** فڕین بە هەردووباڵ مانای ڕاکردنە لە کارە ترسناکەکان کە دێنە دی.

**٥-فـێڵ:** ئەگـەر کەسـێکت بـینی لـە خـەودا فێڵت لـێ ئەکات نیشانەی ئەوەیە لە ئاگاداریدا سەرئەکەوی بەسەریدا.

**٦-فرمێسـك:** فرمێسك لە خەودا دەروازەو سامانە ئەگەر بە گریانەوە بێت، وە بە بێ گریان تانەیە لە خەوبینەکەو قسەی خراپیش بە ڕوویدا ئەکرێ.

**٧-فرمێسـك ڕژان:** فرمێسـك ڕژان لـە خەودا نیشانەیە لەسەر خراپی لە گوزەراندار نـارێکی لـە ئاییـندا، ئەوەی بینی چاوەکانی فرمێسکی دەڕشت باوکی نەخۆش ئەکەوێ.. ئـەوەی بـە چـاوی خۆیـەوە فرمێسـکی ئەبـینی ئـەوە لەسـەر حـەق نی‌یـە بەرامبەر بە منداڵەکانی.

٨-**فڕین**: فڕین لە خەودا بەرزبوونەوەو ناوبانگ و پلەیە.. دەڵێن سەفەرە.. وە دەڵێن ڕاکردنە.. ئەگەر ئافرەتێ حەوی بینی لەماڵی خۆیانەوە بۆ ماڵی پیاوێك ئەفڕێت کە نەیئەناسی، ئەوە شووی پێ دەکات.

٩-**فڕۆکە**: لە خەودا ئەگەر فڕۆکەکە لەسەر زەوی بوو یان لە هەوادا بوو ئەوە نیشانەی سەرکەوتنە بۆ خەو بینەکە، بەڵاّم ئەگەر کەوتە خوارەوە ئەوە نیشانەی ئاگاداری‌یە لە دۆڕانێکی نزیك.

١٠-**فیل**: خەوی فیل نیشانەیە لەسەر بەخت خراپی.. ئەگەر خۆت بینی فیلاویت مانای وایە چەند کەسێ سوود لە تێکۆشانە تایبەتی‌یەکانت وەردەگرن.

١١-**فڕن**: خەوت بە چێشت لێنانەوە نیشانەی گۆڕانە، وە ئەگەر فڕنەکە زۆر گەرم بوو ئەوە بەختەکەت ئاسوودەدار دەبێت، یا فڕنەکەش سارد بێت بەڵام تۆ ڕازی بیت، ئەوە بەختێکی باش ئەبێت.

١٢-**فریشتە**: فریشتە لە خەودا لە زۆر حاڵەتدا ڕەمزە بۆ دایك، وە بەختێکی باشە بە تایبەتی بۆ خۆشەویستان.. وە فریشتەکان گیانە چاکمەندەکانن کە ڕێ نیشانی خەو بینەکە ئەدەن و ئەیانەوێ بۆ ڕێگای ڕاست ڕێنمایی بکەن، وە لە ڕێگای هەڵدێر بیگەڕێننەوە، وە ئاگاداری بکەن لەو ڕاڕەوانەی کە تیایدایەتی (واتە لە ڕێگەکەدا).

١٣-**فنق**: فنق لە خەودا ماڵێکە لە هەوڵدان و ماندوو بووندا، ئەوەی توێکڵی وشکی وەك فنق هەبێ نیشانەیە لەسەر ماتەمین و هەرا.



١-**قـاپ، دەفـر:** هەموو قاپێکی ناو لە خەودا نیشانەی کەل و پەلە، وە ئەوەی پێی بوترێ قاپ بۆ سامان وەك سندوق و گونیەو فیشەکدان، ئەوە نیشانەیە لەسەر دڵ، وە هەرقاپێ کە بشکێ نیشانەی نەهامەتی و مردنە.. وە ئەوەی ئەدزرێ یان ئەفرێنرێ لە قاپ کە دزەکە یان رفێنەرەکە نابینرێ ئەوە فەوتاوەکە ناگەرێتەوە.. وە ئەو خەوەی دزەکە یان رفێنەرەکەی تیادا بناسرێت ئەوە فەوتاوەکە ئەگەری هەیە بگەرێنرێتەوە.

٢-**قەرەبالغی خەڵك:** ئەگەر لە خەودا قەرەبالغی‌یەکی گەورەی خەڵك بینرا ئەوە بەختێکی باش و رووداوێکی کۆمەڵایەتی‌یە.. وە ئەڵێن ئەوە رەمزە بۆ تەنگاوی بوون.

٣-**قـاز:** خەو بە قازی سپی‌یەوە مانای خۆشی و سەروەت و سامانە، خەو بە قازی رەشەوە نیشانەیە بۆ ئاگاداریی لە ئاژاوەی خێزانی.

٤-**قەڵا، بورج:** بینینی قەڵای بەرز نیشانەی تێروانینە بۆ پاشە رۆژێکی بەختیار.. چوونە سەر قەڵاکە سەرکەوتنێکی مسۆگەرە.. وە دابەزین لە قەڵا نیشانەی دۆڕاندنە.. وە کەوتن لەسەر قەڵا نیشانەی رقی خواو باوك و دایکە.

٥-**قەساب:** قەساب لە خەودا پیاوێکی دوژمنە ئەگەر جلەکانی پیس بوو، وە چەقۆیەکی بە دەستەوە بوو.. بەڵام ئەگەر قەسابەکە جلەکانی پاك بوون ئەوە نیشانەی تەمەن درێژی‌یە لە دونیادا.. وە قەسابی ناسراو ئەگەر حاڵی لە خەوەکەدا باش بوو ئەوە نیشانەیە لەسەر دوا رۆژی باش بۆی.

٦-**قەزوان:** قەزوانی سەوز سوودێکە لە پیاوێکی نەناسراوی توندەوە (شدید).

**٧-قـۆخ:** بینینی قۆخ بێجگە لە کاتی خۆی نەخۆشی‌یەکی توندە، وە لەکاتی خۆیدا ئەگەر گەیبوو، خۆش بوو، ئەوە بەختێکی باشە، وە ئەگەر ناخۆش بوو یان نەگەیبوو، ئەوە نیشانەیە لەسەر ترسان لە ناڕەحەتی.

**٨-قەرز:** قەرز لە خەودا ژێر دەستی و سەرشۆڕی‌یە.. ئەوەی بینی کەوا قەرز ئەداتەوە، یـان حەقـێك ئەداتـەوە، ئەوە سیلەی ڕەحم بەجێ دێنێ یان هەژاری تێر ئەکات یان کاری خەلکی ئاسان ئەکات.

**٩-قـاپ:** قـاپ لـە خەودا ئافرەتە یان گوزەرانی ماڵە، ئەگەر باش بوو لە خەودا یان نـرخی زیادی کردبوو نیشانەیە لەسەر باشی حاڵی ژن یان گوزەران.. وە فرۆشتنی قاپ لە خەودا بینینی نیشانەیە لەسەر دارایی و ئاسایش.

**١٠-قامچی:** قامچی لەخەودا هێزو دەسەڵاتە، خەوت بە قامچی‌یەوە نیشانەیە لەسەر هـێزو دەسـەڵات، وە بەکارهێـنانی بـۆ لـێدان مانـای بـانگ کردنە بۆ ڕاستیی، ئەگەر لـێدراوەکە ئێشـی پێگەیشـت مانـانی ڕازی بوونـیەتی بـە ڕاسـتیی، ئەگـەر ئێشی پێ نەگـەیاند نیشـانەی ڕازی نەبوونـیەتی بەڕاسـتیی.. ئەگـەر لـە کـاتی لێداندا خوێن ڕژا نیشـانەیە لەسـەر سـتەم، وە ئەگـەر خوێـن نـەڕژا نیشانەیە لەسەر ڕاستیی.. وە پچڕانی قامچـی لـە کـاتی لێداندا ڕۆشتنی دەسەڵاتدارێکی لێدەرە، وە چەوتی قامچی نیشانەیە لەسەر چەوتی کاروباری لێدەرەکە.

**١١-قـەراغ دەریـا:** ئەگەر لە خەودا لە قەراغ دەریادا بوویت مانای ئەوەیە حەزت لە مۆڵەت و حەسانەوەیە.

**١٢-قـژ:** قـژی سـەر لە خەودا مانای ئەوەیە بە دوای کاروباری دوا ڕۆژتا ئەگەڕێیت، ئەوەی لە خەودا بینی قژی سەری درێژ بووە، ئەوە تەمەنی درێژ ئەبێ و ڕزق و سامانی زیاد ئەکات بە تایبەتی ئەگەر قژی قات قات و داهێنراوبێت و خاوەنەکەی دڵخۆش بێت پێی، ئەگەر خەوت بینی قژت بە دانەهێناو قژت خاوێن و درێژ بوو ئەوە نیشانەی بەختیاری‌یە، وە ئەگەر کەسێکی تر قژی خاوێن بوو ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی خۆش بە.. وەرینی قژی سەر لـە خەودا نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی و زیان.. وە قژی سپی نیشانەی سەرکەوتنە.. وە قژی

ڕەش نیشانەی پەشیمانی‌یە.. وە قژی نارێك نیشانەی ناكۆكی‌یە.. وە قژی نەرم نیشانەی هێمنی گوزەرانە.

١٣-**قوقەی كەڵەشێر:** قوقەی كەڵەشێر لە خەودا نیشانەی هەواڵ بیستنە بۆ تۆ.

١٤-**قاپ و قاچاغ:** قاپ و قاچاغ لە خەودا ڕەمزە بۆ خۆشەویست.. ئەگەر قاپێكی جوانت بینی ئەوە خۆشەویستەكەت جوانە، بە تایبەتی ئەگەر خواردنی شیرینی تێدا پێشكەش كرا وە شكانی قاپ مردنە بۆ نەخۆش.

١٥-**قاپی پڕ:** قاپی پڕ لە خواردن یان میوە یان نان نیشانەی دەستكەوتێكی گەورەیەو خێرێكی فراوانە.

١٦-**قاپی خاڵی:** قاپی خاڵی نیشانەی جەنجاڵی‌یە.

١٧-**قەلە ڕەش:** قەلە ڕەش لە خەودا ڕەمزە بۆ پیاوێكی خراپەكار.. ئەگەر لە خەوەكەتدا قەلە ڕەشێكت بینی بۆ شوێنێكی دوور ئەفڕی، ئەوەی پێ‌یەوە خەریكی ئەنجامەكەی باش ئەبێت، بەڵام ئەگەر لە خەوەكەدا قەلە ڕەشەكە بۆ لای تۆ فڕی ئەوە تووشی ناڕەحەتی دەبیت.. ئەگەر لەسەر لقی درەختێك بینیت ئەوە هاوڕێ‌یەكی دوو ڕووت هەیە، ئەگەر گوێت لە دەنگی بوو ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی ناخۆش بە.

١٨-**قوماش:** ئەگەر خەوت بینی قوماشێك لەبەر ئەكەیت ناڕەحەتی دەورت ئەداو كەسێ فێڵت لێ ئەكات، بەڵام ئەگەر ئەو قوماشە گۆڕرا بۆ پۆشاك ئەوە ئەو فێڵە دەگۆڕرێت بۆ كت و پڕی‌یەكی خۆش.

١٩-**قەفەز:** قەفەزی پڕ لە باڵندە لە خەودا نیشانەی بەختێكی ئاسوودەیە لە جووت بووندا. وە بە بەتاڵی نیشانەی ناڕەحەتی‌یە.. وە بینینی گیانداران لە قەفەزدا نیشانەی سەركەوتنە.

٢٠-**قەفەزی مریشك:** قەفەزی مریشك نیشانەی حاڵە، ئەگەر بینیت قەفەزێكی مریشكت كڕیوەو مریشكی تێدایە یان مریشكی تێ چووە نیشانەی ئەوەیە ماڵێك ئەكڕیت یان لەگەڵ ژنەكەتدا دەگوازیتەوە بۆ ماڵێكی نوێ.

٢١-**قفڵی شكاو:** خەو بە قفڵی شكاوەوە مانای دزی‌یەكی چاوەڕوانكراوە.

٢٢-**قاوە خواردنەوە:** خواردنەوەی قاوە لە خەودا مانای ماندوو بوون و سەرقاڵی‌یە.

٢٣-**قاوە تێکردن:** تێکردنی قاوە لە خەودا مانای دڵە راوکێ‌یە.

٢٤-**قفڵ:** قفڵ لە خەودا نیشانەی ژنە، وە کلیلیش مێردە.. ئەوەی قفڵێکی بە کلیل کردەوە، ئەگەر عازەب بێ ژن ئەهێنێ.. ئەگەر ژنی هێنابێ ئەوە نیشانەی کرداری سێکسی‌یە.. وە بۆی هەیە کردنەوەی قفڵ نیشانە بێت لەسەر سەرکەوتن بەسەر بەرامبەرەکەدا وە نیشانەی کردنەوە لە دنیاداو فراوانی رۆزی بێت.. هەموو داخستنێ غەمە و هەموو کردنەوەیە دەروازەیە..

٢٥-**قفڵ داخستن:** ئەوەی لە خەودا بینی قفڵێك دائەخات ئەوە نیشانەی خواستنی ئافرەتێکە.

٢٦-**قیرین:** قیرین لە لێکدانەوەدا سامانێکی خیانەتکاری‌یە.. وە لەکەدار بوونی پۆشاك بە قیرین ناتەواوی‌یە لە مووچەدا، وە رژاندنی بە مرۆڤێکدا تاوانبار کردنیەتی.

٢٧-**قوتابخانە:** رۆشتن بۆ قوتابخانە لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئارەزوو بۆ زیاد بوونی زانست، بەلام خەو بە نارەحەتی خوێندنەوە لەقوتابخانەدا نیشانەیە لەسەر نارەحەتی‌یە بەردەوامەکان، وە ئەگەر خۆت وانەت ئەوتەوە نیشانەی بەختێکی چاکە، بەلام ئەگەر وانەت ئەوتەوەو هەندێکت بیر چوو ئەوە نیشانەی نارەحەتی‌یە، وە ئاگاداری‌یە کە تۆ شیاوی کارێکی نوێ نیت کە حەز دەکەیت پێی هەستی، لەبەرئەوە پێویستە باشتر هەوڵ بدەیت تا سەرکەوتوو بیت تیایدا.

٢٨-**قەیسی:** خواردنی قەیسی لە خەودا نیشانەی نەخۆشی‌یە، بەلام قەیسی سەوز چاك بوونەوەیە، وە زەرد خەرج کردنی ماڵە لە نەخۆشیدا.. وە لێکردنەوەی قەیسی لە درەخت ژن هێنانە.

٢٩-**قورئانی پیرۆز:** خەو بە هەڵگرتنی قورئانی پیرۆزەوە مانای داواکردنی نیازی خۆیەتی لای خواو دوای یارمەتی کردنە لە پەروەردگار.

٣٠-**قور:** ئەگەر قورت بینی مانای دەسکەوتی ماددی‌یە، وە چوونە ناو قورەوەو پیس بوون پێی مانای وایە کەسێ ئەیەوێ خۆی بهاوێتە ناو شەرەفتەوە یان تۆ ئەبێ بە

قوربـانی هەڵـەی کەسـێکی تـر کە بە بێ ڕەوای هەق، ئەگەر ویستت رزگارت بکات لە قوڕەکە، ئەوە نیشانەی ناڕەحەتی داهاتووەو ئاگاداری‌یە.

٣١-**قـاچ**: ئەگـەر خـەوت بینی قاچت لە حاڵێکی باشدایە، ئەوە نیشانەیەکی باشە، بەڵام ئەگەر بە ئاوساوی بینیت، یان بە ئێشەوە، ئەوە چاوەڕوانی ناڕەحەتی بکە.. وە ئەگەر بینیت قاچت ئەشۆرد بە تایبەتی لە رووباردا یان لە دەریادا ئەوە نیشانەی سەرکەوتنە.

٣٢-**قـاپ**: قـاپ یان شووشە لە خەودا نیشانەی ئافرەتە یان کچ یان کوڕ، وە بە پێی رادەی جوانـی و دروسـتیی قاپەکـە ئاوبراوەکانیش جوان و دروست ئەبن.. وە شکانی قاپ مـردنی یەکـێکە لەوانـەی بـاس کـران ئەگەر ئەخۆش بن، وە ئەگەر نا ئەوە ناڕەحەتی و ناخۆشی‌یە.

# ( ك )

١- ؤێـر: لـه خـەودا رەمزە بۆ کوێری لە ئاستی هەقدا.. با هەق ئاشکراش بێت ئەو نابیینـێ، قسـەی پـێ ناکـات و کرداریشـی پـێ ناکات، وە چێژ وەرناگرێ لە راستیی و گـەورەیی و زانسـت.. وە کوێـری لـە خـەودا مانای خۆ کوێر کردن و وازهێنان و گێلی و دوورکەوتنەوەیە لە شتی گرنگ.

٢- کـەڕی: کـەڕی و کـەڕ لـە خـەودا مانای وایە کەڕە لە ئاستی هەقدا، بێ بەرییە لـێی. وە گـوێی بـۆ ناگـرێ و قسـەی پێ ناکات، نەبیستنی گوێ لە خەودا فەسادە لە ئاییندا، هەڕەشەیە لە ژیان، لەوانەیە نیشانەی نەمانی حەسانەوە بێت.

٣- کەروێشك: خەوی ئافرەتی شووکەر بە کەروێشکەوە مانای منداڵ بوونە.

٤- کچ: خـەو بـە کچـانی جـوان و زۆرەوە بەڵگەیـە لەسـەر بەختیاریی.. بەڵام ئەگەر کچەکان لەش و لاریان لاواز بوو بەڵگەیە لەسەر ناخۆشی، بینینی کچ لە خەودا نیشانەی ئەوەیە دنیا پێشوازیت لـێ نەکات.

٥- کاڵەك: بینینی کاڵەکی سەوز لە خەودا لەش ساغییەو.. خواردنی کاڵەکی گەیوو لـە خـەودا چـاك بوونەوەیـە بـۆ نـەخۆش و بەربوونـە بـۆ بەندکراوو بەڵام بینینی غەم و نەخۆشییە.

٦- کوللە: کوللە لە خەودا نیشانەیە لەسەر سەربازو چەکدارو دەنگە دەنگی ئەوانەی پۆل پۆل شەپۆل ئەدەن.

٧- کوزەڵە: خواردنی کوزەڵە لە خەودا باش نییە.

٨-**کەری ئاسایی:** بینینی کەری ئاسایی مانای ماندوویی‌یەو سوار بوونی نەمانی ئەو ماندوێتی‌یەیە.

٩-**کـەری رەش:** سـواربوونی کەری رەش لە خەودا نیشانەی لەسەر خێرو سەربڵندی و ئاسوودەیی.

١٠-**کەری وەحشی:** کەری وەحشی لە خەودا نیشانەی تێکچوونە لەگەڵ هاورێیەکدا.

١١-**کۆتـر:** کۆتر ئەگەر فڕی بۆ لات یان نیشت بە تۆوە یان لەتیشکی خۆردا دیار بوو، ئەوە خەوێکی زۆر پیرۆزە، مژدەیە بە بەختیاری و خێرو خۆش گوزرانی، ئەگەر فڕی و لێت دوورکەوتەوە، ئەوە بیر لە کەسێك ئەکەیتەوە کە دوورە لێتەوە، وە ئەگەر کۆترەکە مردبوو یان یاز بە بێ هودە ئەتویست بیگری ئەوە نیشانەی دۆڕانە، ئەگەر کۆترت لە خەودا بینی بـە زیـندوویی ئەوە چاوەڕێی شادی بە لە خۆشەویستیدا، ئەگە بە مردوویی بینیت ئەوە دۆڕاندنی تێدایە.

١٢-**کۆتـری سـپی:** کۆتـری سـپی ئەگـەر لـە خـەودا چیلکەی هەڵنەگرت نیشانەی ئاشتی‌یە.

١٣-**کاوڕ:** کاوڕی بچووك ئەگەر قەڵەوو یاری زان بوو ئەوە خەوێکی چاکە.

١٤-**کوژەکـە:** خـەوت بـە لەبەرکـردنی پۆشـاکی کوژەکەوە لە کاتێکدا کە دڵخۆشـی پـێی، نیشـانەی بەختـێکی بـاش نزیکە، وە ئەگەر دڵخۆش نەبیت ئەوە لەگەڵ ئەوەشدا بەختـت باشـە، هەرچـەندە ناخۆشـی و هـەندێ دۆڕاندنی لەگەڵدایە، ئەگەر خۆتت بینی کوژەکە ئەژمێری، ئەوە مانای ئاسوودەیی‌یەکی باشە.

١٥-**کەڵەشـێر:** کەڵەشێر لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاوی شکۆدارو دەنگ دوور، وە خەو بینین بە کڕینی کەڵەشێری رۆمی‌یەوە یان بیخۆی خەوێکی خۆشە، وەهەروەها ئەگەر زیندوو بێ و لە تەندروستی‌یەکی باشدا بێت، بەڵام ئەگەر مردبێت و پەڕی لەسەر بێت ئەوە چاوەڕوانی دۆڕان بە.

١٦-**کـرم:** بینـینی کـرم لـە خەودا نیشانەیە بۆ دوژمنی ناشکرا کە ئەیانەوێ فێڵ بکەن.

١٧-**كەرە:** كەرێ لە خەودا سامان و ڕۆزی چاکە، ئەوەی بینی کەرە ئەخوات لە جۆرێکی چاك نیشانەیە لەسەر دەستکەوت و سوودو تەندروستی باش و چاك بوونەوە لە نەخۆشی، بەڵام ئەگەر کەرەکە چاك نەبوو ئەوە نیشانەیە لەسەر دۆڕاندن، ئەگەر خەوت بینی کەرە ئەکڕی یان ئەیفرۆشی ئەوە ئاگاداریی دەستکەوتێکی ماددی کەمە.

١٨-**کاتژمێری خڕ:** کاتژمێری دەست یان گیرفان نیشانەیە لەسەر گوزەرانی ئێستا بۆ خەوبین، ئەگەر کاتژمێرەکە جوان و ڕێك و بێ هەڵە بوو ئەوە گوزەرانی خەو بین باشە، وە ئەگەر ناڕێك بوو ئەوە گوزەرانی خەو بین تێکچوو ئەبێت.

١٩-**کاتژمێری لە کار کەوتوو:** کاتژمێری لەکار کەوتوو لە خەودا مانای مردنە یان وەستانی گوزەران لە زۆربەی حاڵدا.

٢٠-**کاتژمێری دیوار:** بینینی کاتژمێری دیوار لە خەودا نیشانەی هەواڵی ناخۆشە، ئەگەر گوێت لێ بوو زەنگی لێ ئەدا ئەوە نیشانەی ترسناکی‌یە.

٢١-**کەوتن:** کەوتن لە شوێنێکی بەرزەوە لە خەودا مانای گۆڕانی حاڵ و نەهامەتی ئاواتە، وە کەوتن لە قوڕێکداو پیس بوونت نیشانەی ئەوەیە کەسێ دژی تۆ قسە ئەکات، ئەگەر کەسێکت لەو حاڵەدا بینی ئەوە چاوەڕوانی هەواڵی ناخۆش بکە.

٢٢-**کونجی:** کونجی لە خەودا ماڵێکی تەواوە لە زیاد بووندا بۆ کەسێ بیبێ یان بیخوا.

٢٣-**کۆپان:** کۆپان لە خەودا ئەگەر بە بەرزە ولاخەوە نەبوو جیابوویەوە نیشانەیە لەسەر ئافرەتێکی جوانی دەوڵەمەندی ناسك، وە نیشانەیە لەسەر پلەو پایەیەکی بەرز، وە ئەگەر لەسەر بەرزە ولاخ بوو ئەوە خۆشی ئافرەتە، وە ئەڵێن ئەوەی سواری کۆپان بێت سەرئەکەوێت لە کارەکانیدا.

٢٤-**کەوتنە خوارەوە لە بەلەکۆنەوە:** کەوتنە خوارەوە لە بەلەکۆنەوە لە خەودا مانای ترساندنە لە دۆڕاندن.

٢٥-**کەچەڵ:** ئەگەر کەسێکی سەر رووتاوەت بینی یان کەچەڵ لە خەودا ئەوە ئاگاداری‌یە بۆت لە کەسانێ ئەیانەوێ زیانت پێ بگەیەنێ.. ئەگەر ئافرەتێکی سەر

رووتـاوه یـان کەچـەڵت بینی ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ دووبەرەکی‌یە کە روو نەدات.. وە ئەگەر خۆتت بینی سەرت رووتاوە بووەو ئەوە بەم نزیکانە هەواڵێکی ناخۆش ئەبیستی.

**٢٦-کڵاو:** کڵاو لە خەودا بانگ کردنە بۆ ئاهەنگ.. یا ماڵ و سامانێکە دێت بۆ خەو بینەکە.

**٢٧-کرێکار:** ئەگەر کرێکارێکت بینی لەسەر کارەکەی نیشانەیە لەسەر بەختت، ئەوە سامانێکت دەست ئەکەوێ یان کارێکی نوێ کە بەرەو بەختێکی ئاسوودە ئەتبات.. ئەگەر کرێکارەکەت دوای کاتی ئیشەکەی بینی نیشانەی دیاری‌یە.

**٢٨-کـار، ئیش:** ئەگـەر خەوت بینی بە توانایەکی زۆرەوە ئیش ئەکەی، یان ئەترسای ئیشەکەت لە کاتی خۆیدا تەواو نەبێ نیشانەی بەختێکی ئاسوودەیە.

**٢٩-کـردنەوەی قوفڵـەکان:** کلـیل لـە خـەودا سـەربەرزی و دەسـەڵاتە، وە ئەڵـێن دەسـتکەوتێکی گەورەیـە، وە کـردنەوەی دەرگاکـان و قاسـەکان و کـیلۆنەکان بـە کلیل نیشانەیە بۆ سەرکەوتن و سامان و وەفا.

**٣٠-کـردنەوەی شوێنە داخراوەکان:** کردنەوەی شوێنە داخراوەکان لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئاسان بوونی ناڕەحەتی و رۆزیی بە دەست هێنان.

**٣١-کـاری خـێر:** کـاری خـێر لـە خەودا نیشانەی گوێڕایەڵی خوای گەورەیە، ئەوەی کارێکی خێر بکات ئەوە سامان و رۆزی‌یەکی باش بە دەست ئەهێنێ.

**٣٢-کراس:** کراس لە خەودا نیشانەیە بۆ ئایین.. ئەوەی درێژ بێت لەبەریدا یان کورت یان خـاوێن یـان پـیس، ئـەوە لـە ئاییـنی خەوبینەکەدایە، وە نیشانەشە بۆ حاڵی پیاوو گوزەرانی.. ئەگەر پیاو لەبەری کرد ئەوە ئافرەتێ شوی پێ ئەکات و بۆ ئافرەتیش پیاوێك لەیخوازێـت.. وە کـراس ئەگـەر پـیاوێك لەبـەری کردو دڕا ئەوە واز لە ژنەکەی ئەهێنێ و ئەگەر کەسێ بینی کراسی زۆری هەیە نیشانەی گوزەرانی باشیەتی.

**٣٣-کۆشـك:** ئەگـەر لـە خـەودا چوویتە کۆشکێکەوە، ئەوە گەورەیی و دەسەڵاتت بە دەسـت هێـناوە بەتایـبەتی ئەگـەر کۆشـکەکە هـی خـۆت بێـت، بـەڵام ئەگەر چوویتە کۆشکێکەوەو هی خۆت نەبوو لە خەوەکەدا ئەوە قازانج و خێرت بە دەست هێناوە.

٣٤-**کوشتار**: کوشتار له خەودا نیشانەی ئەوەیە چەند دوژمنێکت هەیە هەوڵ ئەدەن سەرکەون بەسەرتا بەتایبەتی ئەوەیان کە تلاوەتەوە بە خۆشەویسیەوە.. ئەگەر خەوت بینی سەرکەوتوویت بەسەر فرمانەکەتدا مانای وایە ناڕەحەتیەکان زۆر جیڕ ئەبن، بەلام ئەگەر سەرکەوتی بەسەر کەسێکی تردا ئەوە ئەنجامەکەی باش ئەبێت.

٣٥-**کوشتن**: کوشتنی مرۆڤ یان ئاژەڵ لە خەودا مانای سەرکەوتنی خێراو مژدەی خۆشە.

٣٦-**کولەکە**: خەوبینین بە کولەکەوە نیشانەیە لەسەر سك بوونی ژن.

٣٧-**کورکە**: کورکە لە خەودا بۆ کەسێ بیبینێ یان بیخوات بە لێنراوی چاك بوونەوەیە بۆ نەخۆش و زانستە بۆ قوتابی و رێنماییە. بۆ گومڕا، ئەوەی بە پێنەگەیوی بیخوات ئەوە لەگەڵ کەسێکدا تێك ئەچێت.

٣٨-**کتێب**: کتێبی زانستی لە خەودا نیشانەی گەشتی ئەو کەسەیە بە پلەیەکی زانستی گەورە کە هێزی ئەداتێ، وە کتێبی خراپ نیشانەی نەمانی شەرەفە.. وە کتێبی دڕاو یان پیس ئاگاداریەیە لە کەسانێ کە بە دەوری خەوبینەکەوەن و کارتێکردنی خراپیان هەیە بۆ سەری.. وە کتێب بە دەستی مندالەوە مژدەیە.. وە بە دەستی ئافرەتیشەوە دوورکەوتنەوەیە لە کاری گرنگدا.. وە کتێبی قەدکراو نیشانەی مردنە.

٣٩-**کورسی**: کورسی لە لێکدانەوەدا بەرزییە.. دانیشتن لەسەر کورسی لە خەودا نیشانەی سەرکەوتن و پایە بەرزییە، ئەگەر دانیشتووەک ژنی هەبێ، وە ئەگەر عازەب بێ ئەوە ئافرەتێ ئەخوازێ بە ئەندازەی بەرزی و جوانی کورسیەکە.

٤٠-**کەمانچە**: خەو بەوەوە کە کەمانچە ژەنیت یان گوێی لێ ئەگری بەڵێنە بە بەختێکی ئاسوودەی نزیك و خۆشیەکی خێزانیی بە هۆی دراوسێوە یان هاوڕێ.

٤١-**کێك**: کێك لە خەودا رەمزە بۆ تەنگەتاوی بۆ ئەو کەسەی ئەیخوات، وە رەمزی سەفەرە بۆ کەسێ بیبینێ، وە رەمزی غەمە بۆ کەسێ دروستی بکات.. وە دەڵێن خەوێکی چاکە بۆ لاو لە کاتی خۆشەویستیدا.

**٤٢-کەلەرم:** کەلەرم لە خەودا بۆ کەسێ بیخوا نەخۆشییە.. وە بۆ کەسێ بیکڕێ یان ببینێ غەم و ناڕەحەتییە، وە دەڵێن خەو بە کەلەرمەوە مانای ئەوەیە تۆ داوای شتێك ئەکەیت هەستی پێ ناکەیت تەنها بە پەرتەوازەیی و ساردی نەبێت.

**٤٣-کل:** ئەگەر لە خەودا کلت کرد بە کل نیشانەی ئەوەیە لەگەڵ دوو ئافرەتدا کۆ دەبیتەوە.. وە ئەگەر بە بێ کل کلت کرد نیشانەی ئەوەیە ئەکەویتە ناو فرمانێکی پێچەوانەوە، وە ئەگەر کەسێکت بینی کلی تۆی ئەکرد ئەوە شتێك لە سامانەکەی ئەو ئەستێنی.. کچی عازەب ئەگەر کلی کرد لە خەودا ئەوە شوو ئەکات وە هەروەها بێوەژنیش.. وە ئافرەتی شوو کردووش ئەگەر لە خەودا کلی کرد نیشانەی ئاسوودەی دەروونیەتی.

**٤٤-کفن:** خەو بە کفنەوە نیشانەی حاڵ خراپیە لە خۆشەویستیدا، وە نیشانەی فەوتانی خۆشەویستەکەیە.. وە لە خێزاندا نیشانەی فەوتانی یەکێکە لە ئەندامەکانی.. بە گشتی نیشانەی گواستنەوەیە بۆ شوێنێکی خراپتر، لە فەرمانبەریدا بێ یان لە پلەو پایەدا بێ.

**٤٥-کەتان:** خەو بە کەتانی خاوێنەوە باشە.. ئەگەر لە خەوەکەدا ئەتشۆرد یان هەڵت ئەواسی بە تەنافێکەوە تا وشك ئەبێتەوە نیشانەی سەرکەوتنە بەسەر ناڕەحەتییەکانی ئێستاتدا.. بەڵام ئەگەر کەتانەکە پیس بوو ئەوە نیشانەیەکی خراپە.

**٤٦-کەوەر:** خواردنی کەوەر لە خەودا نیشانەی نوستنە.. وە خواردنی بە لێنراویی نیشانەی تەوبەیە، وە دەڵێن خواردنی کەوەر لە خەودا نیاشنەی ئەوەیە کە تۆ دەگەیت بە ئەنجامدانی ئاواتەکانت لە رێگای تێکۆشان و ئارامگرتن لەسەر ناڕەحەتییەکان.

**٤٧-کڵێسا:** بینینی کڵێسا لە خەودا نیشانەی سەرکەوتنە یان بەدیهاتنی ئاوات.

**٤٨-کسپە:** ئەگەر خەوت بینی هەنگێ یان زەردەواڵەیەك پێیەوە دایت، یان بە کەسێکی ترەوە بدا، ئەوە ئاگاداریە لە هاوڕێیەکی بێ وەفا.

**٤٩-کلیل:** کلیل و کۆمەڵە کلیل لە خەودا دەسەڵات و سامان و بەختی گەورەیە، بە گەنجینەش لێك ئەدرێتەوە.. ئەوەی بینی تووشی کلیلێك هاتووە یان چەند کلیلێك ئەوە

تووشــی دەســەڵاتداریّ و ســامانیّ ئــەبیّ بــە رادەی بینیــنەکەی.. ئــەوە بــینی بە کلیلیّك دەرگایــەك ئەکاتــەوە تــا ئەیکاتــەوە، ئەو کلیلە دوعایەو وەڵام ئەدرێتەوە بۆی.. وە ئەڵێن کلیل لە خەودا رۆزی و یارمەتی‌یە، وە کلیلی تەختە پیسە، وە کلیلی ئاسن سەرکەوتنە.. وە ئەڵـێن بـە تایـبەتی ئەگـەر کۆمەڵـە کلیلـێکی پـیّ بوو ئەوە زانست و یارمەتی لە دوژمــنەکانی‌یەوە دەســتگیر ئــەبیّ.. وە بینینی کلیل بۆ پایەداران دەروازەیە.. ئەوەی بینی کۆمەڵـە کلیلێکی زۆری بە دەستەوەیە ئەوە دەسەڵاتێکی گەورە بە دەست ئەهێنیّ.. ئەوەی بـینی دەرگایـەکی کـردەوە یـان قفڵـێك ئـەوە بەسەر دوژمنەکانیدا سەرئەکەویّ.. ئەوەی دەرگایـەك بـە کلـیل بکاتـەوە ئەوەی ئەیەویّ بە دەستی ئەهێنیّ، وە ئەگەر بەشتێکی کە کـردیەوە ئەوە پێویستی‌یەکەی دەستەبەر ئەکات.. ئەوەی بینی کلیلێکی هەڵگرتووە، ئەوە سـامانێکی دەستگیر ئەبیّ، ئەگەر خاوەنی سامان بوو با زەکاتی لـیّ دەرکات، وە خەو بە ون کـردنی کلـیلەوە یـان کۆمەڵـە کلیلـیّ نیشانەی ون کردنی خۆشەویستە یان کار یان پـارە، وە دۆزینەوەی کلیل نیشانەی ئەوەیە نهێنی‌یەك ئەزانیت بیّ سوودە بۆت. وە بینینی کلیل لە خەودا بۆ راوکەران یان ئەوانەی لە دەریادا ئەژین رۆزی و سامانی زۆرە.

٥٠-**کارگــە**: ئەگــەر لــە خەودا لە کارگەیەکدا نیشت ئەکرد مانای وایە تۆ کارەکەی خۆت ئەگۆڕی.

٥١-**کــێڵگە**: ئەگەر کێڵگەکە لە خەوا سەوز بوو ئەوە نیشانەیەکی چاکە، وە ئەگەر بە خـێرایی گـەورە دەبـوو ئەوە هەواڵی خۆشی چاوەڕوان نەکراو بەم نزیکانە پێت ئەگات.. وە خــەوت بــە رۆشتنەوە لە کێڵگەیەکدا کە سەوز بێت، مانای وایە تۆ تیّ ئەکۆشی لە کاری خـێرو ســامان و بەســووددا.. ســەوزیی لــە کێڵگەکاندا نیشانەی بەختیاری و چاوەڕوانیی دەســتکەوت و خــێرو هاتــنەدی ئاواتە.. وە بینینی کێڵگەی سەوز نیشانەیە لەسەر کاری خــەون بــین، چــونکە کارکــەر چێنەری چاکەو خراپەیە.. ئەگەر کێڵگەکە گەشاوەو سەوزو بــەرز بــوو، ئــەوە ئیشــەکەیەتی.. ئەگەر وشك و زەرد بوو هەروەها ئەویش ئیشەکەیەتی.. ئــەوەی بــینی زەوی‌یــەك ئەکــێڵیّ، ئەوە بۆ خاوەن هاوسەر منداڵەو بۆ عازەب هاوسەرەو بۆ خــاوەن بــەروبووم زیــاد بوونــی بەرهەمەکەیــەتی و بــۆ فەرمانــڕەوا فــراوان بوونــی

فەرمانڕەوایی‌یەکەیەتی.. ئەوەی بینی بە کێڵگەیەکی سەوزدا ئەڕوا ئەوە هەوڵ ئەدا لە ئیشی چاکەو خێردا.. وە سووتانی کێڵگە لە خەودا برسیەتی و قات و قڕی‌یە، ئەگەر کێڵگەکە سووتابوو بەناویدا ئەڕۆیشتی ئەوە نیشانەیەکی چاکە.

**٥٢-کورسی:** خەوت بە دانیشتنەوە لەسەر کورسی‌یەکی حەساوە زۆر چاکە بۆ بەرزەوەندی‌یەکانی ئیشەکەت، وە خەوت بە کەوتنەوە لەسەر کورسی مانای ناڕەحەتی‌یە کە تووشت ئەبێ بە هۆی کارەکەتەوە، وە بینینی کەسێکی تر بە حەساوەیی لەسەر کورسی‌یەکەی مانای بیستنی هەواڵی خۆشە.. بەڵام ئەگەر لەسەر کورسی‌یەکە کەوتە خوار ئەوە هەواڵەکە ناخۆشە.

**٥٣-کەشتی:** کەشتی لە خەودا لە ئاوێکی هێمندا بێ یان لە قەراغ ئاودا بەڵێنە بە بەختیاری لە خۆشەویستیدا.. بەڵام ئەگەر لە دەریایەکی شەپۆلاویدا بوو یان ڕەشەباوی ئەوە بەختیاریی‌یەکە دوائەکەوێ. ئەگەر کەسێکی ترت بینی سواری کەشتی‌یەك ئەبێ کە کەل و پەلەکەی هەڵگرتبێ ئەوە بەڵێنە بە سەرکەوتن لە کارەکەتدا.. سوار بوونی کەشتی ڕەمزی ڕزگاربوونە بۆ کەسێ لە غەمدا بێت یان تەنگەتاوی یان نەخۆشی یان ناڕەحەتی یان قاتی، وە ڕەمزە بۆ بازرگانی و دابەزین لێیەوە، وە ڕەمزە بۆ بەجێهێنانی پێویستی‌یەکان و گەیشتنە مەبەست.

**٥٤-کانزا:** هەموو کانزایەکی زەوی وەك ئاسن و پۆڵاو مس و برۆنزو ئالتوون و گۆگردو زیوو جۆری تر لە خەودا سامان و دەستکەوت و زانستی هەڵگ[illegible]وە.. ئەوەی بینی لە خەودا کانزایەکی دەستکەوت یان زیاتر ئەوە مژدەیە بۆی بە زۆری سامان و قازانج ئەگەر جوتیار بێ یان بازرگان یان خاوەن پیشە، وە زانست بە دەست ئەهێنێ ئەگەر قوتابی بێت، وە سەرکەوتن بە دەست ئەهێنێ بەسەر دوژمندا ئەگەر تێکۆشەر بێت، وە سەرفرازی و سەرکەوتنە بۆ بێجگە لەمانە.

**٥٥-کوڕ:** ئەوەی لە خەودا بینی کۆمەڵێ کوڕی هەبوو ئەوە بینینەکە نیشانەی خەفەتە، چونکە زۆری منداڵ خەفەتە، ئەوەی بینی کوڕێکی بچووکی بوو ئەو زیادی‌یە لە دنیادا دەستگیری ئەبێ، ئەوەی بینی کوڕێکی گەورەی بوو ئەوە هێزو توانایە.

٥٦-**كاغەزی دەرەچێ**: دەرەچێ لە خەودا (یانسیب) بەختێکی خراپە.

٥٧-**کشتبان ( پەنجە پارێز لە کاتی درووماندا )**: لە خەودا نیشانەی گۆڕانی بەختە بۆ باشتر، ئەگەر خەوت بینی گومت کردو ئەگەڕایت بە دوایدا، ئەوە لەو حاڵەتەدا ناڕەحەتی بەرەنگارت ئەبێتەوەو خۆشیەکەت دوا ئەکەوێ، بەڵام هەموو شتێ کۆتایی دێت بە خێرو خۆشی.

٥٨-**کەنیشك- عذراء**: کەنیشك لە خەودا بۆ کەسێ ببێ بە خاوەنی دنیایە، وە رزگاربوونە بۆ ناڕەحەتمەندان و ناڕەحەتی یە بۆ پلەو پایەداران.



١-**گومـڕا لە ڕێبـاز:** گومڕایی لە ڕێباز لە خەودا بەڵگەیە لەسەر دانەواندن بۆ ناهەق و ڕێنموونی نەکردنی ڕێگای ڕاست یاز پەل کوتان لە ڕێگاو لە پێویستی.

٢-**گـورج و گوڵـی:** گـورج و گوڵـی مرۆڤ لە خەودا نیشانەیە لەسەر خاوی جوڵان، وە ئەگەر جوڵاوەکە نەخۆش بوو ئەوە نیشانەی مردنیەتی.

٣-**گـریان:** گـریان لـە خـەودا ئەگـەر بـە بـێ هاوارو شەپۆڕ بێت نیشانەی خۆش و ناسـوودەیی‌یە، وە ئەگـەر بـە چەپۆك و هاواردوە بوو ئەوە نیشانەیە لەسەر خراپە، هەندێ جار گریان نیشانەیە بۆ جووت بوون ئەگەر گریانەکە لە کەسێکەوە بێت خۆش بوێت.

٤-**گۆمـاو:** ئەگەر خۆتت بینی لە پاڵ گۆماوێك ئاوەکەی پاك بوو ئەوە بەختت چاکەو، بـە پێچـەوانەی ئـەوەوە ئەگـەر ئاوەکـەی پاك نەبوو ئەوە هاوڕێیەك لەگەڵتایەو دڵنیابە بەخیـتاری چـاوەڕوانتان ئـەکات، خـەو بینینـت بـە سـواری کەشتی‌یەوە لە گۆماوێکدا خەوێکی چاکە، بەڵام ئەگەر کەشتی‌یەکت بینی ژێر ئاو کەوت ئەوە ناخۆشی‌یە.

٥-**گەیشـتن بـە ئـاوات:** ئەگـەر لـە خەودا گەیشتیت بە ئاواتت ئەوە ئاگادای‌یە کە پێویستە ئاگاداری خۆت بیت لە داهاتوریەکی نزیکدا.

٦-**گـوێ:** گـوێ لە خەودا بەڵگەیە لەسەر کوڕو ماڵ و پلەو پایە، وە لەوانەیە بەڵگە بێ لەسەر زانست و هۆش و ئاین و کەس وکار، ئەگەر یەکێ لە خەویدا بینی گوێی کەم نەبیسـتێ یـان نەخۆشـە بەڵگەیە لەسەر گومڕایی.. بڕینی گوێ یان ون کردنی بەڵگەیە لەسـەر خـراپەکاری.. وە گـوێی جـوان و زیادە نیشانەی زیادبوونی زانستە بۆ پیاوان، وە

نیشـانەی زیاد بوونی خشڵ و رووکەش کراوەکانە بۆ ئافرەتان.. ئەگەر یەکێ بینی پەنجەی ئەخاتە گوێیەکانی‌یەوە بەڵگەیە لەسەر مردنی.. و گوێی سەرکردە جاسووسەکەیەتی.. وە ئەگـەر یەکێ بینی گوێی بە جوانی ئەبیستێ نیشانەی تێگەیشتن و زانین و تەندروستی و ئاییـنی‌یەتی، ئەگـەر یـەکێ بـینی یەك گوێی هەیە، ئەوە بەم زووانە ئەمرێ.. وە ئەگەر یەکێ بینی کەرە ئەوە لە باوەڕەکەیدا سەری لـێ شێواوە.

**٧-گوێگرتن**: گوێگرتن لە خەودا نیشانەیە لەسەر نهێنی ئاشکرا بوون.

**٨-گـا**: گـا لـە خەودا نیشانەیە لەسەر سەرۆك خێڵ یان ماڵ یان شار یان لادێ، یان کار.. ئەوەی بینی خاوەنی گایەکی زۆرە ئەوە گەورەیی‌یەك بە دەست ئەهێنێ ئەگەر بۆ ئەوە بشێ.

**٩-گەوهەر**: خەو بە گەورەوە خەوێکی جوانە سەرەتایەکی چاکە لە ژیاندا..

**١٠-گێزەر**: ئەگەر گێزەرێکت بینی بە دەستەوە لە خەودا ئەوە خۆشی‌یە دوای ناخۆشی. وە خواردنـی گـێزەر نیشـانەیە لەسـەر تـووش بوونـت بـە قازانجێك کە دوای ناڕەحەتی و ئەشکەنجە دەست ئەکەوێت.

**١١-گـەرما**: ئەگـەر لـە خـەودا گـەرمات بوو کاتیش زستان بوو ئەوە رۆزی‌یە، وە لە هاویندا هەژاری‌یە، وەکو چۆن سەرمان لە زستاندا هەژاری‌یەو لە هاویندا رۆزی‌یە.

**١٢-گـژو گـیای سـەوز**: گـژو گیای سەوز لە خەودا نیشانەیە لەسەر سامانی دونیاو رۆزی‌یەکەی.

**١٣-گوریس**: گوریسـی ئاسایی لە خەودا نیشانەی پەیمان و راستیی و جاڵە، بینینی پەتی هەڵواسراز لە خەودا نیشانەیە بۆ مردن.

**١٤-گـەرماو**: ئەگـەر خـەوت بـینی بـە ئـاوێکی پـاك خۆت ئەشۆیت ئەوە نیشانەی ئاسـوودەیتە لەگـەڵ سـۆزی پـاکدا.. بـەڵام ئەگـەر ئاوەکـە پیس بوو ئەوە ئاگاداری‌یە بۆ بیستنی هەواڵی ناخۆش.

**١٥-گوژاڵـك**: گوژاڵـك لـە خـەودا نیشـانەیە لەسەر پیاوی خراپ یان لەسەر قسەی خراپ.

**١٦-گورگ:** گورگ لە خەودا پیاوێکی ستەمکاری خراپەکارە.. وە بینینی گورگ نیشانەی ئەوەیە دوژمنێکت هەیە کە بە راوکردنی سەردەکەوی لە ئیشێکدا کە بە لاتەوە گرنگە.. وە کوشتنی گورگ سەرکەوتنە بەسەر دوژمندا.. ئەگەر بینیت کە گورگێ هێرشت بۆ ئەهێنێ و سەرئەکەوێ بە سەرتا ئەوە ئاگاداری‌یە لە کارێکی ترسناك، وە ئەگەر گورگێکت بینی لە قەفەزێکدا بەسترابووەوە بە زنجیرەوە ئەوە دوژمنێکت هەیەو ناتوانێ زیانت پێ بگەیەنێ.

**١٧-گەشت:** سەفەرو گوێزانەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر لە خەودا نیشانەیە لەسەر گواستنەوە لە حاڵێکەوە بۆ حاڵێکی تر بە گوێرەی حاڵی دوو شوێنەکە، ئەگەر خەوت بینی سەفەر ئەکەی یان سەفەرکەری ئاگاداری‌یە بۆ گۆڕانی گوزەرانت و بەختت، وە ئەگەر دڵخۆش بوویت لە سەفەرەکەدا، ئەوە گۆڕانەکە زیانت پێ ئەگەیەنێ.. گەشت لە خەودا ئەگەر خۆش بوو ئەوە سوودو قازانجە، وە ئەگەر ناخۆش بوو ئەوە ناڕەحەتی‌یە.

**١٨-گەشت بۆ دەرەوە:** سەفەرێك بۆ دەرەوەی وڵات لە خەودا نیشانەیە لەسەر سەفەرێکی ناسوودە لەگەڵ هاوڕێیاندا، ئەگەر گوێت لێ بوو یان قسەت ئەکرد بە زمانی بێگانە لە خەوەکەدا ئەوە بەڵێنە بە سەرکەوتن ئەگەر دەرکەوتیتەوە لە وڵاتەکەت.

**١٩-گونیە:** گونیە لە خەودا نیشانەیە لەسەر پاراستنی نهێنی و دەرکەوتنی شتێك تیایدا نیشانەیە لەسەر ئاشکرا بوونی نهێنی‌یەکە، هەروەها مەشکەیش.

**٢٠-گرژ:** دەم و چاو گرژ لە خەودا نیشانەی لە دایك بوونی کچێکی نوێیە.

**٢١-گالیسکە، عەرەبانە:** ئەگەر خەوت بینی سواری عەرەبانەی ئەسپ بوویت، مانای وایە ماڵێکی کەمت دەست ئەکەوێ، ئەگەر لەگەڵ ئافرەتێکدا سوار بووی مانای ئاگاداری‌یە لە سواری‌یەکی نزیك.

**٢٢-گالیسکەی وەرگەڕاو:** ئەگەر لە خەودا بە سواری گالیسکەیەکەوە بوویت و وەرگەڕایت، یان رووداوێکی بەو جۆرە رووی‌دا ئەوە گیاندارێك ئەمرێ کە خۆشت ئەوێ.

**٢٣-گەردەلول:** گەردەلول لە خەودا نیشانەی ناڕەحەتی و دۆڕاندنە.

**٢٤-گەستنی سەگ:** گەستنی سەگ لە خەودا مانای وایە دوژمنێك کە دژ بە تۆیە بە دواتەوەیە.

**٢٥-گوشـین و گوشراو:** گوشین و گوشراوی قامیش و پرتەقاڵ و ترێ و رۆن و جۆری تر لـە خـەودا زۆر چاکە، بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یەو بۆ نەخۆش چاك بوونەوەیەو بۆ بەند کراو بەرزبوونەوەیـەو بۆ قەرزار قەرزدانەوەیەو بۆ عازەت جووت بوونەو بۆ قوتابی رەوان کردنی زانستەکەیەتی.

**٢٦-گۆرانـی:** گۆرانی لە خەودا قسەی ناشیرین و نارەحەتی‌یە، ئەگەر دەنگەکە خۆش بـوو ئـەوە نیشانەیە لەسەر بازرگانی‌یەکی بەسوود، وە ئەگەر دەنگەکە خۆش نەبوو، ئەوە بازرگانی‌یـەکی زەرەردارە، گۆرانـی بـێژ لـە خـەودا پیاوێکی داناو زانایە.. وە گۆرانی لە خـەودا نیشانەیە لەسەر رووداني حەواڵی راست و چاك بوونەوە لە دەردو نەخۆشی.. ئەگەر لـە خـەودا گۆرانیـت ئەوت، یان کەسێکی تر گۆرانی ئەوت خەوێکی چاکە، ئەگەر شاد بیـت بـە گۆرانی‌یەکـە، بەڵام ئەگەر دەنگەکە ناقۆڵا بێت یان رازی نەبی لە گۆرانی‌یەکە نیشانەی بوونی هاورێ‌یەکی ستەمکارە یان خۆشەویستێکی ناپاك.

**٢٧-گەردانە:** گەردانـە لە ئاڵتوون بێت یان لە زیو یان لە کوژەکە (خرز) یان لەهەر خشڵێکی تر لە خەودا نیشانەی جووت بوونێکی بەختیارو وەرگرتنی ئەمانەتە.

**٢٨-گۆڕ:** هەموو خەوەکانی گۆڕ نیشانەیە لەسەر نارەحەتی بە مردن یان جیابوونەوە، وە گۆڕی مندالآن نیشانەی لە دایك بوونی منداڵێکە کە بە بچووکی ئەمرێت، وە بینینی گۆڕێکـی کـراوە نیشـانەی ماتەمی‌یـە، وە بینـینی گۆڕێکـی نەکـراوە نیشـانەی ئەوەیە هاورێ‌یەکـت لـە دەسـت ئەدەیـت کـە بە مردن تەواو نابێت.. وە ئەگەر گۆڕەکە رووپۆش کـرابوو بـو گـوڵ و سـەوزایی جـوان دڵنیابە کە نارەحەتیەکانت بەسەر ئەچن و ئەبێ بە خۆشـی‌یەکی بـەربڵاو، وە ئەگـەر خۆتـت بـینی بـەرەو گۆڕێـك ئەچیت ئەوە بەشێك لەو سـامانەی هەتـە لـە دەسـتی ئەدەیت، ئەگەر خۆتت بینی لەسەر گۆڕێك وەستاویت ئەوە قـەرزێك سەرشـانت ئەگرێـت.. وە ئەگـەر بینیت کەسێك نێژرا لە گۆڕێکدا بە بێ ئەوەی

مردبێت ئەوە سەرئەکەویت بەسەر زیانێکی داهاتوودا، ئەوی لە خەویدا گۆڕێك هەڵکەنێ ئەوە ژنێکی بەخیل ئەخوازێ.

۲۹-**گومەز:** گومەز لە خەودا ئافرەتە، ئەوەی گومەزێك ببینێ یان بیکڕێ ئەوە ژن ئەهێنێ، ئەوەی گومەزێ بڕوخێنێ و ژنێکی نەخۆشی هەبێ ئەوە ژنەکەی ئەمرێ، ئەگەر ژنەکەشی نەخۆش نەبێت ئەوە تەڵاقی ئەدات.

۳۰-**گەنم:** خەو بە گەنمەوە یان جۆ خەوێکی چاکە، وە ئەگەر بە کێڵگەیەکی گەنم و جۆدا ئەچوویت ئەوە چاوەڕوانی هەواڵێکی زۆر خۆش بە.. ئەوە زۆر باشترە ئەگەر لە خەوتدا گەنم و جۆت کۆ ئەکردەوە.

۳۱-**گەنجینە:** دەستکەوتنی گەنجینە (کنز) لە خەودا مانای ژن هێنانە بۆ عازەب و مانای سك پڕ بوونی ژنە بۆ مێرد، وە ئاسانی‌یە بۆ کەسێکی ناڕەحەت، وە دەرچوونە بۆ قوتابی، وە گەڕانت بە دوای گەنجینەی شاراوەدا، بە تایبەتی ئەگەر زەوی هەڵبکەنی مانای وایە کەسێکت خۆش ویستووەو متمانەت پێی هەبووەو شایانی ئەو خۆشەویستی و متمانەیە نی‌یەو خەوت بەوەوە کە ئاڵتوونێکت دۆزیبێتەوە لە هەر شێوەیەکدا بێت خەوێکی چاکە با گەنجینەکەش داپۆشرابێت، گەنجینەو قاسەی ئاسنین لە خەودا نیشانەیە لەسەر دڵی پیاوی بەهێز وە لەسەر شێوازی دەروونی.

۳۲-**گۆگردی گڕدار:** گۆگردی گڕاو لە خەودا سەرکەوتنی شەرەفە.

۳۳-**گۆگردی نەگڕاو:** گۆگردی نەگڕاو لە خەودا ناڕەحەتی‌یە لە خۆشەویستی‌دا.

۳٤-**گۆشت:** گۆشت لە خەودا مانای سامانە ئەگەر لێنرابێت، وە بینینی گۆشتی نەکوڵاو هەمووی ئێش و نەخۆشی‌یە، وە کڕینی لە قەساب ناڕەحەتی‌یە، گۆشتی ئاسك لە خەودا نیشانەی مردن و غەیبەت کردنە. وە گۆشتی مانگا نیشانەیە لەسەر نەخۆشی. وە گۆشتی حوشتر سامانێکە لە دوژمنێکی بەهێزەوە، وە ئەگەر بە کوڵاوی یان برژاوی خواردت ئەوە رۆزی و سامانە لە لایەن ئافرەتێکەوە، وە ئەگەر پێنەگەیشتبوو ئەوە غەیبەتە بۆ ئافرەت و زوڵم لێکردنی.. وە گۆشتی مەڕ ئەگەر لە خەودا بە نەکوڵاوی خورا ئەوە چاکەیە، وە ئەگەر تەنها بینیت و نەتنەخوارد ئەوە باش نی‌یە، ئەگەر بە کوڵاوی

خورا ئەوە نیاشەی زیادی‌یە لە ماڵ و گوزەراندا.. لە خەودا گەر گۆشتت نەخواردو سوودت لـێ دەبینی و قەڵەو دەبوویت پێی ئەوە چاکەیەکی زۆر لە ئیشەکەتدا لە بەردەمتایە، بە بـێ چـاوەڕوانی سامانێك بە دەست دێنیت، بەڵام ئەگەر لاوازتر ئەبوویت ئەوە ئاگاداری‌یە بە زیانێکی ماددی، وە ئەگەر گۆشتت ئەفرۆشت یان ئەتکڕی ئەوە بەختێکی چاکە.

٣٥-**گـرەو کـردن:** هـەموو جـۆرە گـرەوێك لـە خەودا مانای ئاگاداری‌یە لە بردنەوەو دۆڕاندن لە کاتی بە ئاگاییدا.

٣٦-**گسـك:** گسـك دانی ماڵ بە گسك لە خەودا نیشانەی مردنی نەخۆشێکە، ئەگەر نەخۆشـی تـێدا نـەبوو ئـەوە لـە کـیس دانـی پارەیە.. وە گسکدانی زەوی و کۆکردنەوەی زبڵەکەی یان خۆڵەکەی مانای تووش بوونی خێرێکی گەورەیە لـێ‌یەوە.

٣٧-**گـەرم کـەرەوە:** هـەواڵی خـێرایە، ئەگەر لە کار کەوتوو بوو یان شکابوو، ئەوە هەواڵەکـە خـراپـەو ئەگەر پڕ بوو لە دووکەڵ ئەوە نیشانەی دۆڕانە، بەڵام ئەگەر ئاگرێکی رێك و پێکی گڕداری تێدابوو ئەوە نیشانەی داڕۆژێکی بەختیارو سەرکەوتووانەیە.

٣٨-**گڵـۆپ:** ئـەو بە گڵۆپی شەوق دارەوە نیشانەیەکی چاکە.. وە نیشانەی ئومێدە بۆ رزگـاربوون لـە ناڕەحـەتی، وە ئەگـەر هاوڕێ‌یـەکی نوێـت هەبێـت ئـەوە دڵـپاك ئەبێت بەرامبەرت، وە گڵۆپی بێ رووناکی مانای دۆڕاندنە.

٣٩-**گاسـن:** گاسـن لـە خـەودا سـەرکەوتنە لە خۆشەویستی و ساماندا، بە تایبەتی ئەگەر گاسنەکە رووەو تۆ بوو.

٤٠-**گـوڵ:** کۆکـردنەوەی گوڵ لە خەودا خێرە، چونکە هیواو روانینە، بە تایبەتی گەر گوڵـەکان جـوان بن و باخچەکە یان کێڵگەکە رازاوە بێت، بەڵام ئەگەر گوڵەکان مردووبن یـان سـیس بن ئەوە نیشانەی ناڕەحەتی‌یە، ئەوەی بینی لەسەر سەری چەپکێك گوڵ هەیە ئەوە ئەبێ بە خاوەن هاوسەرو خۆش گوزەران ئەبێ لە دنیادا، ئەوەی گوڵ بێجگە لە کاتی خۆیدا ببینێ ئەوە تووشی غەم دەبێـ، وە گوڵی هەمە رەنگ نیشانەیە لەسەر دنیاو تامی شیرینی، وە گوڵ بۆ ئافرەت مژدەدانە بە سك بوون.

٤١-**گوڵــی سروشتی:** گوڵی سروشتی لە خەودا نیشانەی خۆشەویستی و بەختی باشە، ئــەی بــینی گوڵ لــێ دەکاتەوە تووشی خۆشەویستی دەبێت، ئەوەی لە بێستانێ گوڵێکی سـپی لـــێ کـردەوە ئەوە ماچی ئافرەتێکی ترسناك ئەکات، ئەگەر گوڵێکی سووری لــێ کـردەوە ئەوە ماچی ئافرەتێکی دەنگ سازو گاڵتەجارِ ئەکات، ئەوەی بۆنی گوڵێکی زەردی کـرد ئەوە ماچی ئافرەتێکی نەخۆش ئەکات.. وە گوڵی زۆر ماچی زۆرە، وە گوڵێك هێشتا نەکرابێتەوە نیشانەی کورِ بوونە بۆ کەسێ ژنێکی سك پرِی هەبێت.

٤٢-**گوڵی دەستکرد:** خەو بە گوڵی دەستکردەوە نیشانەی رارِایی و دوو دڵی‌یە.

٤٣-**گوڵــی پــرتەقاڵ:** ئەگــەر گوڵی پرتەقاڵت لە خەودا بینی ئەوە لە بارەی جووت بوونــەوە هــەواڵ ئەبیســتی، ئەگــەر گوڵــی پرتەقاڵت کۆئەکردەوە ئەوە جووت بوونەکەت دواناکەوێ، وە ئەگەر هاوسەرت هەبوو ئەوە بەختێکی ئاسوودەت تووش ئەبێت.

٤٤-**گەوهــەری شەوچرا (یاقوت):** یاقوت لە خەودا شادی و ناخۆشی‌یە، ئەوەی بینی یــاقوتی لــە دەســتدایە ئــەوە جوانکاری‌یــەکی قەشــەنگی دەبێــت، ئــەوەی بینی یاقوتی هەڵگــرت، ئەوە چاوەرِوانی کورِ ئەکات، بەڵام کچی ئەبێت، وە ئەگەر ئەیویست ژن بهێنێ ئەوە ئافرەتێکی جوانی چاك ئەهێنێ، ئەوەی نقێمی گەورەی دەستگیر بێ ئەوە پارەی دەست ئەکەوێ.

٤٥-**گژنیژە:** گژنیژەی سەوز نیشانەی ئەوەیە پیاوێ سوودت پێ ئەگەیەنێ، وە گژنیژەی وشك نیشانەیە لەسەر سامانێکی نوێی چاك.

٤٦-**گوێزان:** گوێزان لە خەودا رەمزە بۆ زمانی پیس کە زیان بە خەڵکی ئەگەیەنێ.

٤٧-**گەســك:** گەســك لــە خەودا سوودو خزمـەتکارە، چونکە لادانی خۆڵە، وە هەموو ئەوانە سامانن و پێویستی پێی نی‌یە.

# ( ل )

١-**لاڵ**: لاڵ و لاڵـیی لـە خەودا مانای وایە ناتوانێ راستیی بڵێ بە پێی ئەم ئایەتە: ﴿صم بكم عمي فهم لا يرجعون﴾.

٢-**لـووت**: لوتـی کەوانـەیی لـە خـەودا ڕەمزە بۆ فرو فێڵ.. لووتی درێژ بەڵگەیە بۆ زیـادبوونی کەسـانی خـێزانەکە.. وە لووتی کورت بەڵگەیە لەسەر تێکچوون و ئاژاوە.. وە لووتی ڕێك ‌ر جوان بەڵگەی بەختێکی باش و رزگار بوونە.

٣-**لـووت پـژان**: لـووت پژان لە خەودا قازانجەو خێرە بۆ کەسێ لە خەوەکەیدا ببینێ لووتی ئەپژێ.

٤-**لاشـە**: لاشـەی بەهـێزی مرۆڤ لە خەودا نیشانەی بەهێزیی ئیمانیەتی.. وە قەڵەوی بەڵگـەی حـاڵی چـاکەو.. لاوازی و گۆڕانـی ڕەنگی بەڵگەیە لەسەر خراپی حاڵی.. ئەگەر خـۆی بینی قەڵەوەو حاڵی باشە نیشانەیە لەسەر بەرزی و چارەنووس و سەرکەوتنی بەسەر دوژمناندا..

٥-**لاشـەی مـردوو ( مەیت )**: بینینی لاشەی مردوو لە خەودا نیشانەیە لەسەر مردن و بەلا، وە زۆرجار لاشە نیشانەیە لەسەر مانەوە.. وە بە هەر شێوەیەك نیشانەیە لەسەر چاك بوونەوەی چاوەڕوانکراو.

٦-**لووتکـە**: لووتکـە لـە خـەودا پـیاوێکە بـە ئـەندازەی حـاڵی ئەو لووتکەیە، وە سەرکەوتن بەسەر لووتکەدا بەرزبوونەوەیە.

٧-**لم**: لم لە خەودا سامانە.

٨-**لە خوا ترسان**: لە خواترسان لە خەودا نزیك بوونەوە و خۆش ویستنە بۆ خەڵکی.

۹-**لاو، گـەنج (نێرینـە)**: بینـینی لاو لـە خەودا نیشانەیە بۆ بەخت و رازی بوون و سەرکەوتن بەسەر دوژمناندا، وە مەیسەر بوونی پێویستی‌یەکان.

۱۰-**لاوی کوڕ**: لاوی کوڕ لە خەودا ئەگەر نەناسرابوو ئەوە دوژمنی پیاوە، ئەگەر سپی بوو ئـەوە دوژمنـێکی سـادەیە، ئەگـەر ئەسمەر بوو ئەوە دوژمنێکی دەوڵەمەندە.. ئەگەر قژی زەردو چـاوی شـین بـوو ئـەوە دوژمنـێکی گـیە، ئەگـەر بەهـێز بـوو ئـەوە سـەختی دوژمنایەتـیەتی.. ئەگـەر لاوەکـە ناسـراو بوو ئەوە بە پێی شێوەیەتی.. ئەگەر بەهێز بوو ئەوە نێزەکەیەتی، ئەگەر لاواز بوو ئەوە لاوازیی هێزیەتی لە ئاگاداریدا، ئەوەی بینی دوای لاوێـك کـەوتووە ئـەوە زاڵ ئـەبێ بەسـەر دوژمـنەکەیدا.. ئەگـەر لاوێ دوای کەوت ئەوە دوژمنەکەی زاڵ ئەبێ بەسەریدا.

۱۱-**لاوێ کـچ**: لاوی کـچ لـە خـەودا دوژمنە بۆ ئافرەت بە هەر شێوەیەك بیبینێ، وە کچـی لاوی نەناسراوو رازاوە هەواڵی شادیە، وە لاوی جوان خێروئاسوودەیی‌یە.. وە چاکترین ئافـرەت لـە خـەودا نەناسـراوە.. وە کچـی گەنجی هەرزەکار خێرێکی داواکراووئومێدێکی چـاوەڕوانکراوە، وە کچـی گـەنجی لاواز غـەم و هەژارییـە.. وە گـەنجی رووت زیانـە لـە بازرگانیدا.. ئەوەی بینی کچێك ئەخوازێ ئەوە ئەبێ بە خاوەنی ئایین و سامان.

۱۲-**لاوازیـی**: ئەگـەر لـە خـەودا بێ‌هێزو لاواز بوویت ئەوە لە ئاگاداریدا بەهێزیت، ئەوەی لەخەودا بێ هێزە ئەوە لە ژیانیدا بەهێز دەبێت.

۱۳-**لـێدان**: لـێدان لـە خەودا خێرو چاکەیە، کە لێدراو لە لێدەرەوە دەستی ئەکەوێ، ئەگـەر لـێدانەکە بە دەست بوو یان دار، وە ئەگەر بە قەمچی بوو ئەوە قسەیەکی خراپەو وە ئەگـەر بـە دار بوو ئەوە پیسە، ئەگەر خوێن لە لێدانەکەوە رژایە سەر زەوی ئەوە زیانە بە ماڵ و سامان.

١٤-**لێـنان بەئاگر**: ئەگـەر شتێکت لێنا بە ئاگر لە خەوداو پێگەیی ئەوە بە خێرایی بە ئاواتت ئەگەی، وە ئەگەر پێ نەئەگەیی ئەوە بە ناڕەحەت بە ئاواتت ئەگەیت.

١٥-**لێـبوردن**: ئـەوەی لـە خـەودا بینی لە خەڵك ئەبورێ ئەوە حەقێکی بەسەرەوەیە، ئەگەر کەسێکی تر لەم خش بوو تەمەنی درێژ ئەبێ و سەربەرزی بە دەست ئەهێنێ.

**١٦-لابردن:** لابردن له خەودا نیشانەی روودانی تەلاقە.

**١٧-لافاو:** ئەگەر لافاوێکی گەورەت بینی ئەوە بەرەنگاری مەترسیەك یان ناڕەحەتی‌یەك ئەبیتەوە یان کەسێك خۆشەویستەکەت لە دەست ئەسێنێ، وە ئەگەر ئاوەکە خاوێن بوو ئەوە ناڕەحەتی‌یەکان ئاسان ئەبێ، بەلاّم ئەگەر ئاوەکە پیس بوو، یان پڕ لە قوڕاو بوو ئەوە ناڕەحەتیەکان درێژە ئەکێشن وە خەو بینینت بەوەوە کە بەسەر ئاوەکەدا دەڕۆیت ئەوە سەرئەکەویت بەسەر کۆسپ و ناڕەحەتیەکانتدا.

**١٨-لۆکە:** بینینی لۆکە لە خەودا رەمزە بۆ سامان، ئەگەر خاوەنی لۆکە بوویت، مانای وایە ئاسوودەیی‌یەك بەڕێوەیە بۆت.. ئەگەر لۆکەت شی ئەکردەوە، ئەوە پاککردنەوەی گوناهەکانتە.

**١٩-لۆکەی رستراو:** خەو بە فرۆشتنی‌یەوە یان کڕینی یان دروست کردنی پۆشاکێك لێی خەوێکی باشە، وە دیارییەکی چاوەڕوان نەکراوت بۆ دێت.. وە ئەگەر لۆکەکە ئیشی پێ نەکرا یان لە رستندا ناڕەحەت بوو، ئەوە دیاییەکە بۆ ماوەیەك دوا ئەکەوێت.

**٢٠-لێفە:** لێفە لە خەودا ئافرەت و پیاو خۆیی پێ دائەپۆشێ، ئەوەی بینی لە شەوێکدا لێفەیەکی هەڵگرتووەو پێی ئەخەوێ ئافرەتێ ئەخوازێ یان ئەحەسێتەوەو ئاسایش ئەبێ، وە ئەڵێن ئەگەر لێفە فراوان و خاوێن و سپی بێت مانای وایە ترسەکانت هیچ بنچینەکیان نی‌یە، بەلاّم لێفەی دڕاوو پیس مانای ئەوەیە ترسەکانت بنچینەیان هەیە.

**٢١-لۆمە کردن:** ئەوەی بینی پیاوێ یان ئافرەتێ لۆمە ئەکات ئەوە لۆمە کراوە، بە لۆمە دەربازی ئەبێ.

**٢٢-لابردنی ئەندامێك:** ئەگەر خەوت بینی بە لابردنی یەکێك لە چوار پەلت، ئەوە ژنەکەت ئەمرێ.

**٢٣-لاوازیی:** لاوازیی لە خەودا نیشانەی هەژاریی و لاوازیی حاڵ و تێکچوونی قەدەرە، پاشان ئەگەر لاوازەکە دادگەرێ نیشانەی وشکە ساڵی‌یەو بەرزبوونەوەی نرخە، وە دەڵێن لاوازیی نەخۆشی‌یەو دەشڵێن برسێتی‌یە.

٢٤-**لادێ**: لادێ لـە خـەودا ئافرەتـێـکی پـیری دەست پاکە سامانەکەت ئەپارێزێ، و. ئەڵـێن ئـەوەی لـە خـەویدا چوو بو بۆ دێیەکەی خۆی ئەوە کارەکانی بە دەست ئەهێنێ.. ئـەوەی لـە خـەویدا لـە شـارەوە ئەچـوو بـۆ لادێ ئـەوە رزگـاری ئـەبێ لـە نارەحەتی و ئەحەسێتەوە.

٢٥-**لیمۆ**: لەوانەیە بەمانای لۆمە بێت.. لیمۆ ئەگەر زەردبێ و لـێی بخورێ نیشانەیە لەسەر نەخۆشی، وە ئەگەر لـێی نەخورێ سامانە، سەوزەکەی باشترە لە زەردەکەی.. ئەوەی قاشـێ لـیمۆی دا بـە کەسێ ئەوە لۆمەی ئەکات، وە درەختی لیمۆ پیاوی سوودمەندە بۆ خەڵکی وە دەڵێن ئافرەتێکی خێردارە، بەڵام دەروونی راڕاو لارە.

٢٦-**لغـاو**: لغـاو لـە خەودا نیشانەیە لەسەر بێ تاوانی و خواپەرستیی و دووریی لە خـراپەکاریی، وە نیشـانەیە لەسـەر باشـی جـێ بـە جێ کردن وهێزی سامان بە پێ ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ: (التقی ملجم).



۱-**مرۆڤ:** مرۆڤی نەناسراو ئەگەر گەنج بوو ئەوە دوژمنەو ئەگەر پیر بوو ئەوە نرخ و بەختە.. مرۆڤی ناسراویش ئەو مرۆڤەیە کە بە چاودوەیەو ئەبینرێ.. ئەوەی لە خەودا کەسێکی نەناسراوی بینی کە لە ئاگاداربوونەوەدا نەیئەناسی ئەوە کەسایەتی خۆیەتی.. ئەگەر بینی چاکە بکات ئەوە ئیشکەرەکەیەو ئەگەر بینی خراپە ئەکات ئەوە هەر خۆی ئیشکەرەکەیە.. وە ئەگەر دوانی نەناسراوی بینی و ئەترسا با ئەمین بێ، وە ئەگەر سیانی بینی ئەوە بەڵگەیە لەسەر ترسانی، وە ئەگەر مرۆڤێکی ناسراوی بینی بینینەکەی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی شتێکی لێ ئەسێنێ، وە ئەگەر بینی شتێکی لێ ئەسێنێ بێجگە لە ماڵ ئەوە لەوەوە گەیشتووە بەو شتەی کە ئاواتی ئەخواست.. ئەوەی مرۆڤێکی ناسراوی بینی گوازرابوویەوە بۆ پلەیەکی بەرزو چواردەوری گیرابوو یان بەڵایەکی تووش بوو بوو ئەوە بەڵگەیە لەسەر بارینی خێر یان شەڕ بە شێوەی بینینەکەی بەسەریدا.. ئەوەی شێخێکی بینی قسەی لەگەڵ کرد یان شتێکی دایە ئەوە ئاسوودەیی و خێرو بەختە، ئەوەش بە پێی پیرۆزیی شێخەکەو جوانی روخساری و ناشیرینی و یان ناتەواوی یان هێزو توانینیەتی.

۲-**مانگا:** بینینی مانگا لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاوانی ئایینی و چاك وە نیشانەیە لەسەر ساڵەکان، وە مانگای قەڵەو نیشانەیە لەسەر ساڵێکی بە پیت وبەرەکەت و لەسەر ژنێکی رێك وپێك و مانگای لاواز نیشانەیە بۆ ساڵێکی وشك و قاتی یان ئافرەتێکی ماندوو کەر.

**٣-مراوی:** مــراوی لە خەودا خەوێکی چاکە بە تایبەتی ئەگەر رەنگی سپی بێت، وە ئەگــەر مــراوی‌یەکە ئەفــڕی ئــەوە نیشانەی هەواڵێکی خۆش بە شتێك، وە ئەگەر مەلەی ئەکــرد لــە ئــاوێکی روونــدا ئەوە نیشانەی سەرکەوتنی ئیش و کارە یان جووت بوونێکی دەولەمەندانە.

**٤-میز:** میز لە خەودا نیشانەیە لەسەر خەرج کردنی ماڵ لە شوێنی خۆیدا، وە میز کردن لە خەودا بە زۆری نیشانەیە لەسەر زۆر بوونی رۆزی.

**٥-ماندوو بوون:** خــەو بــە مــاندوو بوونەوە نیشانەی سەرکەوتنە لە ئیشداو ئەگەر یەکێکی تر ماندوو بوو ئەوە هەواڵی خۆشت پێ ئەگات.

**٦-مار:** مــار لــە خــەوا رەمــزی زانــین و چــاك بوونەوەیــە، یــان فــێڵی ئافــرەتان و دووبەرەکی‌یــە، وە نیشــانەیە لەسەر دوژمن و لەسەر ژن و لەسەر ئافرەت و لەسەر ژیان.. ئــەوەی بــینی شەڕ لەگەڵ ماردا ئەکات ئەوە زاڵ دەبێ بەسەر دوژمنێکدا.. وە ئەوەی بینی ســەرکەوت بەســەر مــاردا، ســەرئەکەوێ بەســەر دوژمــندا، وە ئەگەر مارەکە سەرکەوت بەســەریدا دوژمــن ســەرئەکەوێ بەســەریدا.. ئــەوەی بــینی مــار پــێوەیدا ئەوە لە لایەن دوژمــنەکەیەوە تووشی ناخۆشی ئەبێت، ئەوەی بینی لە مارێك ئەترساو یارمەتی نەئەدرا ئــەوە پارێزراوە لە دوژمنەکەی، بەلام ئەگەر یارمەتی درا ئەوە ترسی لــێ ئەنیشێ.. ماری زۆر نیشــانەیە لەسەر ناپاکی و دوژمنایەتی لە لایەن خزمان و هاوسەرو منداڵ و لەسەر ~~هاوسێی~~ ئێرە پێ‌بەر.

**٧-مزگەوتی گــەورە:** مــزگەوتی گــەورە لــە خەودا نیشانەی ~~هە~~ گەریی‌یە بۆ کەسێ بڕواتە ناوی، ئەگەر زوڵم لــێ کراو بێت.. ئەگەر خەو بین لە میحرابی مزگەوتدا وەستابوو واتە لە قیبلەکەیدا نیشانەی رۆزی و ژنی خانەدانە.

**٨-مەرەکــەب:** نووسین بە مەرەکەب لەخەودا نیشانەیە لەسەر بیستنی هەواڵی خۆش لــە سەرچــاوەیەکی چــاوەڕوان نەکــراوەوە، وەدەســت کــەوتنی مەرەکــەب نیشانەیە لەسەر ناخۆشی کە تایبەتە بە هاوڕێیەکت، وە مەرەکەبی سوور نیشانەی هەواڵێکی چاکە.

**٩-مێروو:** مێروو لە خەودا نیشانەیە لەسەر خەڵکانی ناهۆشیار.

١٠-**مووسیلە**: مووسیلەی ئالتوون لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئافرەتی ماڵەکەی ئەڕوا، وە بۆ پیاوان باش نی‌یەو بۆ ئافرەتان رازاوەو جوانە، وە بۆ کەسێ ژنەکەی سکی هەبێت منداڵێکی کوڕە، وە کەوتنی نقێمی مووسیلە لە خەودا مردنی کوڕە یان ون بوونی شتێ لە ماڵ.. وە مووسیلەی زیو نیشانەی سەرکەوتن و بەختیاری‌یە، وە پلە بە دەست هێنانە بۆ کەسێ لە دەستی بکات لە پیاوان، وە یان نیشانەی ژنێکی هاوسەری جوانە.. ئەگەر خەوت بینی کەسێ مووسیلەیەکی پێدایت ئەوە نیشانەیەکی چاکە، وە ئەگەر مووسیلەیەکت کڕی یان فرۆشتت ئەوە نیشانەی رێنمایی‌یە.. وە ئەگەر خەوت بینی مووسیلە لە دەستت کەوتە خوار ئەوە ئاگاداری‌یە لە ناخۆشی، بە تایبەتی ئەگەر خەوبینەکە کچێکی داواکراو بێت ئەوە پێویستە بە چاکی وریای خۆی بێت، ئەگەر خەوت بینی مووسیلەیەکت ون کردووە ئەوە مانای وایە هاوڕێیەکی نوێ پەیدا ئەکەیت.

١١-**مەی**: مەی لە خەودا رۆزی‌یە.. ئەوەی بینی لە خەودا مەی ئەخوا ئەوە رۆزی‌یەکی فراوانی دەستگیر ئەبێ وە بینینی مەی بۆ کەسێ کە بیەوێ جووت بێت یان شەریك بێت چاکە.. وە خواردنی مەی بۆ پاشا کەوتنیەتی لە تەختی پاشایەتی.

١٢-**مریشك**: خەو بە مریشکەوە لەگەڵ جوجکەکانیدا ئاگاداری‌یە لە زیان وە مریشکی زۆر لە خەودا نیشانەیە بۆ منداڵ.

١٣-**مێش**: مێشی زۆر لە خەودا مانای وایە کە دوژمنت هەیە، وە ئەو تەنها مێشەی بە دەورتا ئەگیزێنێ نیشانەیە لەسەر ئەوەی هاوڕێکەت جێگای ئەوە نی‌یە پشتی پێ ببەستی.

١٤-**ملوانکە**: خەو بە ملوانکەوە بۆ پیاو مانای پەیوەندی‌یە بە کارێکی نوێوە، ئەگەر ملوانکەیەکی جوان و گران بوو ئەوە نیشە نوێکە ئاسان و قازانج دارە، ئەگەر ملوانکەکە ئاسایی وکۆن بوو ئەوە نیشە نوێکە سادەیە.. وە ملوانکە بۆ ئافرەت نیشانەی ئەوەیە بەستراوەتەوە بە تەوقێکی باشەوە.

١٥-**مل**: خەو بە ملەوە بەختێکی باشەوسەرکەوتنە لە کاردا، لە کاتێکدا خەوەکە [illegible] یان ملی کەسێکی تر یا ملی گیاندارێکیتر بێت.

١٦-**مێوژ:** مێوژ لە هەر جۆرێ سپی بێ یان ڕەش یان سوور لە خەودا ڕۆزییەکی بەسوودەو چاکەیەکی گەورەیە دەستت ئەکەوێ، بیبینی یان بیکڕی یان بیخۆی.

١٧-**مەلە کردن:** خەوت بە مەلە کردنەوە بە شێوەیەکی باش و بەهێزو لە ئاوێکی ڕووندا خەوێکی خۆشەو نیشانەی سەرکەوتنێکی گەورەیە لە خۆشەویستیی و ژیان و کاردا مادام سەرت لە دەرەوەی ئاوەکەوە بێت، بەڵام ئەگەر بە ناڕەحەتی مەلەت ئەکرد یان ئاوەکە قوڕی تیابوو یان مێروو یان ئەتویست سەرت بۆ سەر ئاوەکە بەرز بکەیتەوە، ئەمانە هەمووی ئاگادارییە لە دۆڕان و دڵە ڕاوکێ.

١٨-**ماسی:** ماسی زیندووی زۆری تازە لە خەودا نیشانەی ڕۆزی نوێ و بەڵگەی قازانجێکی باش و سەرکەوتنێکی گەورەیە.. وە ماسی زیندوو کە ژمارەیەکی دیاری کراوبن لە خەودا ڕەمزە بۆ ئافرەت.. وە ماسی مردوو لە خەودا نیشانەی جەنگە بە تایبەتی ئەگەر لە کاتێکدا لێی بنێیت یان بیخۆیت.. وە ڕاوکردنی ماسی لە دەریاداو لە خەودا نیشانەیە بۆ سەرکەوتن لە کارو ژیاندا.. وە هەوڵدان بۆ گرتنی ماسی بە بێ هوودە لە خەودا نیشانەی دۆڕاندنە لە زۆر کاتدا جیا دەبیتەوە لەو کەسەی کە خۆشت دەوێ.

١٩-**مۆم:** مۆم لە خەودا خێرو پایە بەرزییە، وە نیشانەیە لەسەر مژدەی خۆش ئەگەر گڕەکەی باش بوو.. وە بۆ عازەب هاوسەرەو بۆ جووت بوو دەسەڵاتەو بۆ نەزان ڕێنماییەو بۆ هەژار دەوڵەمەندییە، بەڵام ئەگەر گڕی باش نەبوو ئەوە نیشانەی ساردی گوزەرانە، وە ئەڵێن ڕێنماییە بۆ ڕێگای ڕاست.

٢٠-**مۆمدان:** بینینی مۆمدان لە خەودا نیشانەی هاوسەرە بۆ عازەب و نیشانەی منداڵی جوانە بۆ خاوەن هاوسەر.

٢١-**میوان:** میوان لە خەودا ڕۆزییەکی خێرایە، وە دەڵێن دزە.. دەشڵێن کوڕە.

٢٢-**منداڵ:** خەو بینین بە منداڵەوە بە پێی ئەو حاڵەتانەیە کە منداڵەکەی تیادا دەرئەکەوێ لە خەوەکەدا، بینینی منداڵی بەختیار نیشانەی جووت بوونێکی ئاسوودەیە، وە بینینی منداڵی نەخۆش نیشانەی ناخۆشی و کێشەیە.. وە منداڵی خۆشەویست نیشانەی بۆ ڕازی بوون و بەختیاریی لە دوا ڕۆژدا.. وە دەڵێن بینینی منداڵ کە هاوار

بکـات یان ئاسووده نەبێت و پشتگوێ خرابێت ئەوە ئاگاداری‌یە لە دۆڕاندن.. بەڵام ئەگەر بەختـیارو دڵخـۆش و دەم بـە خـەندە بـوو، ئـەوە نیشـانەی بوونـی چـەند هاوڕێ‌یـەکی خۆشەویسـتە بەتایـبەتی ئەگـەر منالەکە هەردوو قاچی بۆ خەوبینەکە درێژ کردبوو.. وە دەڵـێن ئەگەر منالت بینی لە خەودا مانای وایە تۆ پێویستیت بە کەسێ هەیە کە سۆزی زۆرت هەیـە بـۆی.. وە مندالی شیرەخۆر نیشانەیە لەسەر دوژمن. ژنی شوو کردوو ئەگەر خـەوی بـینی بـە مندالـێکەوە، مانـای وایە سکی ئەبێ و بەم نزیکانە مندالی ئەبێ، وە ئەگەر خەو بینەکە ئافرەتێکی شوو نەکردوو بوو ئەوە مژدەیە بە شوو کردن.

**٢٣-مـندالی ناشـیرین یـان شـێواو:** مـندالی ناشـیرین یـان شێواو لەخەودا مانای ناکۆکی‌یە لە ناو ماڵدا.

**٢٤-مـندالی جوان:** مندالی جوان لە خەودا مانای ئاسوودەیی‌یەکی چاوەڕوانکراوە بۆ خەو بینەکە.

**٢٥-مندالێك ئازاری بدەیت:** ئەو مندالەی لە خەودا ئازاری ئەدەیت نیشانەیە لەسەر زۆرداریی، یان تاوانبار کردنێ تووشت ئەبێت.

**٢٦-مازوو:** خەوی مازوو رەمزە بۆ سامانی تازە پێگەیشتوو.

**٢٧-مـیوە:** میوە لە خەودا جووت بوونە بۆ کەسێ دەستی کەوێ یان بیخوا.. وە دەڵێن مـیوە ئاودارەکـان رۆزی‌یـەکی کاتی‌یـە، وە وشـکەکان رۆزی‌یـەکی زۆری بەردەوامـە، بۆ هەژاران دەوڵەمەندی و بۆ دەوڵەمەند زیاد بوونی سامانە.

**٢٨-مشـك:** مشـکی گـەورە نیشـانەیە لەسـەر رۆزیـی، ئەوەی مشکێکی بینی یاری ئـەکات لـە ماڵـیا رۆزی‌یەکەی زیاد ئەبێ، ئەوەی لە خەودا مشکی دەرکرد لە ماڵەکەی ئـەوە رۆزی و بەرەکـەتی کـەم ئەبێـتەوە، وە بیسـتنی دەنگی مشك نیشانەی پیلانە دژی خەوبیـنەکە کـە تووشی نارەحەتی و زیانی ئەکا.. وە مشك لەسەر نوێن ئافرەتێکی داوێن پـیس و فێڵبازە، ئەڵێن ئەگەر مشکت بینی نیشانەی بوونی دوژمنێکە کە ئەیەوێ زیانت پێ بگەیەنێ، وە ئەگەر دوور لە تۆ رەت بوو ئەوە پێویست ناکا لـێی بترسی، چونکە ئەوە

دوژمــنه ناتوانــێ زیانــت پــێ بگەیــەنێ.. وە دەڵێن خەو بە مشکەوە مانای نار زڕاندن و بەدڕەوشتی‌یە.

**٢٩-ماچ:** ئەگەر ژنەکەت ماچ کرد لە خەودا، نیشانەی ئەوەیە بەم نزیکانە لــێی جیا ئەبیــتەوەو ژنــێکی تــر ئەهێنی، وە ئەگەر ژنێکی تر ماچ کرد لە خەودا ،ئەوە پەیوەندیت لەگــەڵ مــێردەکەیا بەهــێز دەبێــت.. وە ئەگــەر یەکێکــت مــاچ کــرد ئەوە ئاگادار بە لە ئاگاداریدا فێڵت لــێ ئەکات.

**٣٠-ماچــی دوژمن:** ئەگەر دوژمنێکت لە خەودا ماچ کرد نیشانەی ڕوودانی ناڕەحەتی و کێشەیە لە لایەن ئەوەوە بۆ تۆ.

**٣١-ماچی خۆشەویست:** ئەگەر کەسێکت لە خەودا ماچ کرد کە خۆشت ئەویست یان ناسیاوت بوو نیشانەی پەیوەندی و سۆزە لە نێوانتاندا.

**٣٢-مــاچ:** ئەگــەر یەکێ ماچی کردی لە خەودا ئەوە بەختێکی چاکە بۆت.. وە ئەگەر دوژمــن ماچــی کــردی ئــەوە ئاگاداربــە لــە هــاوڕێی فێڵباز، ئەگەر یەکێ ماچی کردی نیشانەی لەسەر ئەوەی سوودت لــێ وەرئەگرێ.

**٣٣-مــەیمون:** خەو بە مەیموونەوە باش نی‌یە، بینینی مەیموون نیشانەی ناپاکی‌یە لە هاوڕێیــەتی و هەڵسوکەوتدا، وە هەروەها تێکچوونە لەگەڵ کەسێکدا لە عادەت بەدەر.. مــەیموون هاوڕێیــەکی ناپاکــە بــە تایــبەتی ئەگەر مەیموونەکەت بینی نەخۆش بوو یان دڵخــۆش نــەبوو، وە ئەگــەر بینیت دڵخۆش بوو وە نەخۆش نەبوو ئەوە چاوەڕوانی زیانێکی ئاسان بکە.

**٣٤-ماست:** بینــینی ماست لە خەودا خێرو بەرەکەتە، وە نیشانەی ڕۆزی‌یەکی چاك و ماڵێکی حەڵاڵە، ئەگەر خۆت ماستت ئەخواردەوە یان کەسانی ترت ئەبینی ئەیانخواردەوە، نیشــانەی ئەوەیە کە خوا زانست بە تۆو ئەوان ئەدات لەگەڵ ئاین ودەروو لــێ کردنەوەدا.. وە ئەگــەر لە خەودا مانگات ئەدۆشی یان گامێش یان حوشتر مانای سەرکەوتنە لە ئیش و کــاردا بە مەرجێ ئەو ئاژەڵانە هێمن بن، وە ئەگەر بینیت ئەتدۆشین یان ماستەکەیانت ئــەخوارد مانای رایە ئافرەتێکی خانەدان ئەخوازی، وە ئەگەر ژنت هێنابێ کوڕێکت ئەبێ

کـە بـە فەڕو بەرەکەت ئەبێ، وە ئەگەر هەژار بێت خوا دەوڵەمەندت ئەکات، وە خواردنی ماستی مەڕ لە خەودا خێرو دڵشادی و حەسانەوەیە، وە ماستەکانی مەڕ بە گشتی سامان و ڕۆزیـە بـە ئـەندازەی ئـەو خواردنە، بەڵام ئەگەر ماستێکی شلت بینی لە قاپەکەیدا، ئـەوە نیشـانەی زیـان و دۆڕاندنـە.. وە شـیری وشـك مالـێکی کۆمەڵە بۆ کەسێ دەستی بکەوێت.

**٣٥-مـرواری:** مرواری لە خەودا زانست و ژن و منداڵە. ئەوەی بینی مرواری ئەفرۆشێ ئـەوە زانسـتێکی گـەورەی پێ ئەبەخشرێ و لەناو خەڵکدا بەرز ئەبێتەوە، وە لە خەودا بۆ عازەب جووت بوونەو بۆ جووت بوو منداڵ بوونەو بۆ بازرگان قازانجەو بۆ قوتابی زانستەو بۆ هەژار دەوڵەمەندی‌یەو بۆ نەخۆش چاك بوونەوەیە.

**٣٦-مـاڵ:** خـەو بـە بـوونە مـاڵی خۆتـەوە نیشـانەیە ڕوودانی چەند کارێکی مژدە هێـنەرە، وە ئەگـەر خانووەکە خۆش بوو نیشانەی ئەوەیە بەختێکی باش لە چاوەڕوانتایە، بەڵام ئەگەر ڕێك و پێك نەبوو ئەوە نیشانەی نەخۆشی‌یەکی نزیکە، وە بینینی چەند پیاوێ کـە خانوو دروست بکەن نیشانەی سەرکەوتنە.. وە بینینی ماڵێ کە ئاگری تێ بەر بووبێ مانـای بیستنی چەند هەواڵێکی خێرایە.. وە ماڵی ڕووناك ئافرەتێکی چاك و گوێ ڕایەڵە یـان بەرگـری کـەرە.. وە خـانووی تاریك نیشانەی ئافرەتێکی ڕەوشت نزم وخوو خراپە.. وە خانووی کراوە ئافرەتی بەرێزە، وە خانووی داخراو ئافرەتێکی بەخیل و ماندووە.. وە خانووی ڕووخاو نیشانەیەکی خراپە.

**٣٧-مـردن:** مـردن لە خەودا نیشانەی ژیانێکی درێژو کامەرانی‌یە.. وە ئەڵێن مانای چـاك بوونەوەیـە.. وە لەوانەیـە نیشـانەی تۆبەو گەڕانەوە بێت بۆ لای خوا، چونکە مردن گەڕانەوەیـە بـۆ لای خـوا، وەکـو چۆن خەوەکانی مردن نیشانەی پایە بەرزی و شەرەفە لە دنـیادا.. ئـەوەی بـینی خـۆی مردووە وە گریان و هاوار بەدی ئەکا وە لەسەر شانی پیاوان هـەڵگیراوە لـە تابووتدا، نیشانەی ژیانێکی درێژو ئاسوودەیە، وە بەرزبوونەوەی پلەو پایەو سـامی بـۆ دوژمـنانی‌یەتی ئەگـەر نەیخەنە ناو گۆڕەکەوە.. بەڵام ئەگەر گۆڕ کرا دنیا زاڵ دەبـێ بەسـەریدا، وە دواکـەوتوانی لـە دەسـەڵاتیا بـە ڕادەی دوا کەوتووەکانـیەتی لـە

تابووتەکەیدا.. وە ئەوەی بینی خۆی مردووەو هیچ شێوەیەکی گریان و هاوار بەدی ناکات نیشانەی رووخانی بەشێکە لە خانووەکەی، وە ئەگەر کچێك خەوی بە مردنەوە بینی نیشانەی خۆشەویستی‌یەکە کە جیا بوونەوەی بە دواوەیە.. بەڵام خەوە بێ سەرو بەرەکان (غامض) لەسەر مردن ئەوە نیشانەی هەواڵی خۆشە.. هەموو خەوێ بە مردنەوە پێویستە باش ئاگاداری بین، چونکە ئاگاداری‌یە.. ئەگەر خەوت بینی خۆت مردوویت یان گوێت لێ بوو یەکێك وتی کە تۆ مردوویت، ئەوە نیشانەی جووت بوونێکی نزیکە یان نەخۆشی‌یەکی نزیك، ئەگەر کەسێکت بینی مردبوو، ئەوە نیشانەی نەخۆشی‌یە بۆ ئەو کەسە یان نیشانەی سەرنەکەوتنیەتی.

**٣٨-مردوو:** بینینی مرۆڤی مردوو لە خەودا نیشانەی سەرەتایەکی چاکە لە ژیاندا وە نیشانەی خۆشەویستی‌یەکە بۆ ئەو کەسەو حەز کردن بە گەڕانەوەی.. وە شێوازی مردوو لە خەودا نیشانەی گوزەرانیەتی لە رۆژی دواییدا، ئەگەر شێوازی باش بوو ئەوە قیامەتی باشە، وە ئەگەر شێوازی خراپ بوو ئەوە قیامەتیشی خراپە، وە قسەکانی و ئامۆژگاری‌یەکانی و تەمێکانی بۆ تۆ لە خەودا راست و رەوانە بە واتا راستەکەی خۆی تەفسیر ئەکرێ، چونکە ئەو لە خانەی دادگەریدایە قسە ناکات بە راستیی نەبێت، بەڵام ئەگەر شتێکی پێدایت ئەوە باشەو تەفسیری دروستە، وە ئەگەر شتێکی لێ وەرگرتیت ئەوە بێگومان باش نی‌یە.. وە بینینی مردوو بە زەرقم بوویی ئەوە نیشانەیە لەسەر خراپی گوزەران.

**٣٩-مەزات:** مەزات لە خەودا نیشانەی پرۆژەی سەرکەوتووە لە کاردا، ئەگەر خەوت بینی لە مەزات خانە شتێکت کڕی ئەوە لە هەموو بوارەکانیدا سەرکەوتوو ئەبیت، مەگەر لە خەودا لە کاتی کڕیندا بێزار بووبیت، ئەوەش مانای ئاگاداری‌یە لە کارەکەتدا..

**٤٠-مۆسیقا:** ئەگەر لە خەودا گوێت لە مۆسیقایەکی خۆشەوە بوو، مانای وایە هەواڵێکی خۆش ئەبیستی لە هاورێ‌یەکی نادیارەوە، وە ئەگەر مۆسیقاکە غەمگین بوو یان ناساز بوو ئەوە بەم نزیکانە غەم دائتنەگرێ.

**٤١-مەقەست:** کردنەوەی مەقەست دوو هۆن دژی یەکتری، رەمزن بۆ ژن و مێرد کە هەمیشە پێچەوانە ئیش ئەکەن، بەلاّم تووشی کەسێ ئەبن کە جیایان ئەکاتەوە.. وە مەقەست نیشانەیە لەسەر بەربەرەکانێ، ئەوەی مەقەستی بە دەست خۆیەوە بینی ئەوە ناچار ئەبێ دژەکەی خۆی بەرێ بۆ لای قازی، وە ئەگەر کورێکی عازەبی هەبوو ئەوە ژن ئەهێنێ.. ئەوەی بینی قژێك یان جلێك بە مەقەست ئەبرێ نیشانەی ئەوەیە پیاوێکی غەیبەت کەرە.. وە ئەوەی خوریەك یان پێستێك یان پشتی ئاژەڵێکی پێ ئەبڕی ئەوە پارەیەك کۆ دەکاتەوە کە گومانی هەیە لەسەری.

**٤٢-مەیدانی جەنگ:** مەیدانی جەنگ لە خەودا مانای تلانەوەیە بە کێشەیەکی عاطفی‌یەوە.

**٤٣-مۆز:** مۆز لە خەودا بۆ کەسێ بیبینێ یان بیخوا خێرو رزژی وسامانە، وە بۆ پیاوی ئایینی خۆشەویستی‌یە.وە ئەگەر درەختی مۆز لە ماڵەکەتدا یان کێڵگەیەکت یان باخچەیەکت گەورە بوو ئەوە نیشانەی لە دایك بوونی کورێکی نوی‌یە بۆ تۆ.

**٤٤-مشار:** مشار لە خەودا نیشانەیە لەسەر جیاکردنەوە دوو دژ بە دادگەرانەو جیاکردنەوەی نێوان ژن و مێرد بە دادگەرانە، لەوانەیە بەڵگەبێ لەسەر دابەش کەرو لەسەر تەرازوو.

**٤٥-مێرگ:** مێرگی سەوز ومێرگی زۆر لە رووەك و سەوزیی نیشانەیە لەسەر دنیاو جوانی‌یەکەی.

**٤٦-ملوخی ( جۆرە رووەکێکە ):** خواردنی لە خەودا مانای هاتنەدی ئاواتەکانە.

**٤٧-مێرووله:** ئەگەر لە خەوتدا مێروولەت بینی ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە تۆ خەریکی کاری بێ سوودیت لە ژیانتدا.. ئەگەر لەسەر جێگاکەت بینیت ئەوە نیشانەیە لەسەر زۆریی منداڵت.. وە دەرچوونی مێروولە لە ماڵت نیشانەی کەمی ژمارەی خزمانتە.

**٤٨-مانگی یەك شەوە:** ئەوەی مانگی یەك شەوەی بینی هەڵهات ئەوە مژدەیە بە لە دایك بوونی کور یان سەرۆك لە کاردا یان قازانج لە بازرگانیدا، ئەوەی کەسوکاری بینی

کۆبوونەتـەوە ئەوە حەج ئەکات، ئەوەی مانگی یەك شەرەی بینی سوور بوو، ئەوە ئافرەتەر مـنداڵەکەی پـێش کامڵ بوونی لەبار ئەچێ. ئەوەی مانگی یەك شەوەی بە تەنها بینی و خـەڵکی سـەیریان ئەکـرد، بـەڵام نـەیان ئەبینی ئەوە نیشانەیە لەسەر ناڕەحەتی گەورە.. ئـەوەی لـە سـەرەتای هەڵهاتنییەوە بینی لە ناوەختی نوێدا ئەوە چاکەیەو شادی تێدایەو هاتنی نادیارێکە یان لە دایك بوونی منداڵێك.. وە هەڵهاتنی مانگی یەك شەوە نیشانەی راسـتیی بەڵێن و سامان دەستگیر بوونە.. وە بینینی مانگی یەك شەوە سەرکەوتنە بەسەر دوژمـندا.

**٤٩-مەرەکەبدان:** مەرەکەبدان لە خەودا بۆ عازەب نیشانەی جووت بوونە.. قەڵەمیش نیشـانەیە لەسەر پیاو، وە نووسین بە قەڵەم لە مەرەکەب دانەوە نیشانەیەکی سێکسییە، وە نـیگار بـە قەڵـەم رەمزە بۆ دڵخۆشی و شەرەف، لە کاتێکدا جلی پێوە پیس نەبووبێ، ئەگەر جلی پیس کردبێ نیشانەیە لەسەر نەخۆشی، وە بۆ هاوسەردار رێزو بەرزبوونەوەیە.

**٥٠-مووبـەق (ژووری چێشـت لێـنان):** ئەگەر لە خەودا خۆتت لە موبەقدا بینییەوە نیشـانەی ئەوەیە چەند هاورێ و خزمێك سەردانت ئەکەن، وە ئەگەر مووبەقەکە خاوێن و گەشاوە بوو ئەوە سەردانەکە بە خۆشی بەسەر ئەچێ، بەڵام ئەگەر مووبەقەکە بە پیسی و نـاڕێکی بیـنرا ئەوە وتوێژێ روو ئەدا کە ئەو سەردانە ئەشێوێنێ.. ئەگەر خۆت لە خەودا مووبەقـت پـاك ئەکـردەوە نیشانەی زاڵ بوونتە بەسەر کۆسپەکانی ئێستاتدا، وە دەگەیت بەبەختێکی ئاسوودە، وە ئەگەر لە خەودا ئاگر بەربوویە مووبەقەکە ئەوە نیشانەی مردنی خزمەتکارەکەیە یان خزمێك.

**٥١-مەراسـیم - رێپـێوان-:** ئەگـەر مەراسـیم بـە شێوەیەکی چاك و پێشکەوتووانە بـەڕێوە ئەچـوو، ئەوە تۆ لە خۆشەویستیەکەتدا بەختیاریت، بە تایبەتی ئەگەر لافیتە لە پێشـەوە بوو مۆسیقاش بە خرۆشەوە لـێ ئەدرا، بەڵام ئەگەر ناڕێك و ناسەرکەوتووانە بوو ئەوە لە خۆشەویستیەکەتدا دۆڕاندن روو ئەدات.

**٥٢-منداڵ بوون:** ئەوەی لە خەودا بینی ژنەکەی کوڕێکی بوو سکیشی نەبوو ئەوە گەنجینەی دەستگیر ئەبێ، ئەگەر سك پڕی بینی کوڕێکی بوو ئەوە کچی ئەبێ وە ئەگەر بینی کچێکی بوو ئەوە کوڕی ئەبێ، وە کچ لە تەفسیردا دەرووەو کوڕیش خەفەتە.

**٥٣-مێخ:** مێخ لە خەودا رەمزی سێکسی‌یە. ئەوەی مێخێ داکوتێ لە دیوارێکا یان لە زەویدا، ئەگەر عازەب بێ جووت ئەبێ، ئەگەر ژنی هەبێ ژنەکەی سکی ئەبێ، ئەگەر مێخێکی بە دیواری ماڵێکدا داکوتا نیشانەی خۆشەویستی‌یە بۆ ژنەکەی.



١-**نیـنۆك:** خـەو بینین بە نینۆکەوە باشە، ئەگەر نینۆکەکانت بینی درێژ بوون، ئەوە بەڵگەیـە لەسـەر دەرچـوونت.. وە ئەگـەر نیـنۆکی بێجگە لە خۆتت بینی درێژ بوو ئەوە چاوەڕوانی هەواڵێکی خۆش بە.

٢-**نـان:** نـانی سـپی لە خەودا نیشانەیە لەسەر رۆزیی چاك و ژیانی خۆش.. وە نانی رەش نیشـانەیە لەسـەر بەدبـەختی لە ژیانداو نانی شیرین بەرزبوونەوەی نرخە، ئەگەر بە هـەنگوین یـان شەکر کرابوو، وە باشترین نان نانی برژاوە لە گەنم کە نیشانەی زانستە بۆ داواکـەری زانسـت..بەڵام ئەگەر لە جۆ بوو ئەوە نیشانەیە لەسەر تەنگی وگرانی.. وە نانی گـەرم دووبەرەکیـەو رۆزییەکە کە شکی تێدایە.. ئەوەی بـنی نان ئەخوا بە بێ درۆ ئەو نەخۆش ئەکەوێ.. وە نانی پیس نیشانەیە لەسەر تای توند.. و کولێرەی پان رۆزی فراوان و تەمەنی درێژە.

٣-**نامـەی ئاسـایی:** نامەی ئاسایی نێرراوو هاتوو نیشانەیە لەسەر هەواڵی باش.. وە نامەی تۆمارکراو هەواڵی بەهێزو راستە، وە وتاری بە پەلەو کاروباری بە پەلەیە.

٤-**نامـەی خۆشەویسـتان:** نامـە ئاڵ و گۆڕ کردنی خۆشەویستان لە خەودا نیشانەیە لەسەر دڵپاکی بەرامبەر یەکتر.

٥-**نامـەی کـراوە:** بینـینی وتـار لە نامەی کراوەداو لە خەودا ئاگادارییە بۆت، کە کەسێك متمانەت پێیەتی نهێنییەکت ئاشکرا ئەکا.

٦-**نامە**: نامـە لـە خـەودا نیشـانەیە لەسـەر پلـەو پایـە بـۆ کەسێ ئەینێرێ یان ئەیگەیەنێ بە کەسێکی تر یان لە کەسێکی ترەوە پێی ئەگات، ئەوە نیشانەی بەختێکی ئاسوودەو کارێکی بەپێزە.

٧-**نامەبـەر**: نامەبەر لە خەودا ئەگەر ڕوو خۆش بوو ئەوە هەواڵی خۆش ئەبیستی لە هاوڕێیەکی نادیارەوە، ئەگەر نا هەواڵی ناخۆش ئەبیستی، وە ئەگەر نامەبەرەکە نەناسی، بەڵام ئەگەر بیناسی ئەوە نیشانەیە لەسەر هەوڵدان لە خێردا.

٨-**نـاکۆکی**: نـاکۆکی ونـەگونجان لـە نێوان خۆشەویستاندا نیشانەیە لەسەر دزینی جووت بوون، بەڵام لە نێوان هاوڕێیاندا نیشانەیە لەسەر پەیوەندی نێوانیان.

٩-**نوێـژ**: نوێـژ لـە خەودا پەیوەندییە بە خواو بە خەڵکەوەو دوعای چاکە بۆ خاوەن خەوەکە، وە ئەڵێن جێگری و سەرۆکایەتی و پەیام و ئەمانەت دانەوەیە.. وە نوێژی فەرز لە خـەودا نیشانەیە لەسەر وەفای پەیمان و کار بۆ بێکار.. ئەوەی بینی نوێژی نیوەڕۆ ئەکات، ئـەوە پێویسـتی‌یەکی ئەدۆزێـتەوە، وە تـەواو کردنی نوێژەکەی نیشانەی تەواو کردنی ئەو شتەیە کە ئەیەوێ، وە نوێژی عەسر نیشانەیە لەسەر بەدیهاتنی کاروبار دوای ناڕەحەتی و ناخۆشـی و نیشـانەی سـەرکەوتنە، وە نوێـژی ئێوارە نیشانەیە لەسەر کار ئەنجام دان.. وە نوێـژی شـێوان نیشـانەیە لەسـەر داپۆشـینی تەواوی کار.. وە نوێژی بەیانی نیشانەیە بۆ سـەرکەوتن و پیرۆزیـی لـە هـەموو کارێکدا.. وە نوێژی هەینی نیشانەیە بۆ دەروازەیەکی نزیك و پێویستی ئەنجام دان.. وە نوێژی جەژن نیشانەیە لەسەر گەڕانەوەی ئەو شتانەی کە تیا چوون، ئەگەر جەژنی ڕەمەزان بوو ئەوە لە ناڕەحەتی دەرئەچێ بۆ فراوانی ڕۆزییەکەی، وە ئەگـەر جـەژنی قوربـان بـوو ئایینەکەی ئەنجام داوەو گوزەرانی باش کردووە، وە نوێژی جەنازە نیشانەی شەفاعەتە لە پیاوێکی خراپ.

١٠-**نینۆکی ئاسایی**: نینۆکی ئاسایی لە خەودا نیشانەی زەفەر بردنە بە دوژمـنان.

١١-**نیـنۆکی بەهـێز**: نیـنۆکی بەهـێز لە خەودا نیشانەیە لەسەر بەهێزیی سامان و چەك.

**١٢-نینۆکی درێژ:** نینۆکی درێژ لە خەودا نیشانەی فراوانی رۆزی و زیادبوونی هێزو سامانە.

**١٣-نەبزوان:** نەتوانینی جوولە کردن نە خەودا مانای نەتوانینە لە دەست پێکردنی پرۆژەیەکی گرنگدا.

**١٤-ناشتن:** گەر لە خەوتدا شتێکت ناشت ئەوە ژن ئەهێنی ئەگەر عازەب بیت، وە منداڵت ئەبێ ئەگەر هاوسەردار بیت.. ناشتن بۆ فەرمانڕەوا ئیشی چاکەیەو بۆ بازرگان قازانجەو گەشەو زیادبوونی سامانەکەیەتی، وە بۆ زانا سەرکەوتن و زیادبوونی زانستەکەیەتی.

**١٥-نوقم بوونی مردوو:** ئەگەر مردوویەکت لە خەودا بینی لە دەریایەکدا یان لە ئاوێکدا خنکا نیشانەی خراپی حاڵیەتی، وە دەرچوونی لە دەریا بە بێ نووقم بوون نیشانەیە لەسەر باشی حاڵی.

**١٦-نووسین:** نووسین لە خەودا نیشانەی هەواڵی خۆشە، ئەگەر ئاشکراو روون و خاوێن بوو وە خۆت دڵشاد بوویت پێی.. زانایانی دەروونزانی تەفسیری نووسین بەوە دەکەن کە بەڵگەیە لەسەر ئارەزووکاری سێکسی.

**١٧-ناکۆکی:** ئەوەی بینی لە خەویدا ناکۆکی مرۆڤێك ئەکات ئەوە غەمێکی ناڕەحەت تووشی ئەبێت.

**١٨-نەخۆشی:** نەخۆشی لە لێکدانەوەدا لەش ساغی و بەهێزیی لاشەیە، بەڵام نیشانەیە لەسەر ناکۆکی و گومان و درووڕوویی.. وە دەرچوونی نەخۆش لە ماڵەکەیدا بە بێ دەنگی لە خەویدا نیشانەی مردنیەتی.. وە دەرچوونی بە قسە کردنەوە نیشانەی ژیانیەتی.. ئەوەی لە ناڕەحەتیدا بێ و بینی نەخۆشە ئەوە رزگاری ئەبێ لە ناڕەحەتیەکەی، بەڵام ئەگەر بینی لە کاتی نەخۆشیەکەیدا مرد نیشانەی ئەوەیە چاوەڕوانی ئاسوودەیی ئەکات، وە ئەگەر خەوت بینی تووشی سوورێژە بوویت نیشانەی ئەوەیە سامانت دەست ئەکەوێ، وە ئەگەر بینیت یان لە نەخۆشێکت بیست کە تووشی سوورێژە بوو بوو ئەوە هەواڵی خۆش ئەبیستی.

١٩-**نووسینگەی کـار:** خـەوت بـە دانیشـتنەوە لە نووسینگەی کاردا بە ئاسوودەیی نیشـانەی سەرکەوتنە.. بەڵام ئەگەر لە دەرەوە بوویت نیشانەی دۆڕانە.

٢٠-**نەخۆشخانە:** خەو بە نەخۆشخانەوە مانای ترسانە لە نەخۆشی.

٢١-**نـەخش:** لـە خەودا کەرامەتەو بەرزی و پلەو پایەو شادی‌یە، ئەگەر مەرەکەبەکە کەوتە سەر کراسەکەی نیشانەیە لەسەر بەرزبوونەوەی پلەو پایەی.

٢٢-**نـێرگز:** ئەگەر لەسەر سەرت تاجە گوڵینەیەکت لە نێرگز بینی لە خەودا ئەگەر عـازەب بیـت نیشـانەی جووت بوونێکی کامەرانە، ئەگەر ژنت هێنابێ نیشانەیە لەسەر جیابوونەوەی ژن و مێرد.

٢٣-**نەخشە:** بینینی نەخشە لە خەودا نیشانەیە لەسەر گەشتی خێراو سەفەری درێژ.



**١-هـاورێ:** وتوێژ لەگەڵ هاوڕێدا لە خەودا نیشانەیە لەسەر ناحاڵی بوون لەگەڵیدا بۆ چەند ساتێ، وە نارەحەتی هاورێ لە خەودا بەختێکی باشە.

**٢-هەڕەشـە:** ئەگـەر خـەوت بینی هەڕەشەت لـە یەکێ کرد ئاگاداری‌یە بۆت لە ون بوونـی مـاڵ یـان پـەیوەندی.. بەڵام ئەگەر کەسێك هەڕەشەی لـێ کردی ئەوە ئاگاداریە بۆت کە دوژمنێکت هەیە پێویستە ئاگاداری بیت.

**٣-هەرەمـەکان:** بینـینی ئەهـرامەکان لـە خـەودا بەڵگەیە لەسەر هەواڵی کۆن، وە بەڵگەیە لەسەر تەمەنی درێژو گرنگی دان بە زانست و هونەر.

**٤-هـەورە بروسـکە:** بینینی هەورە بروسکە لە خەودا نیشانەیە لەسەر تێکچوونێکی خـێرا یان گواستنەوە یان دابڕان، وە ئەڵێن نیشانەیە لەسەر ترسان بۆ سەفەرکەرو تەماح بۆ جێگیر بوو.

**٥-هـێلکە:** هێلکەی چاکی زۆر لە خەودا نیشانەیە لەسەر ئافرەت بە بەڵگەی ئایەتی **﴿کأنهن بیض مکنون...﴾** وە هـێلکەی کـوڵاو ڕۆزی‌یـەکی چـاکەو هـێلکەی شـلاو نیشانەیە لەسەر دۆڕاندن و ئەنجام نەدانی بەڵێن، وە خواردنی هێلکەی کاڵ خواردنی ماڵی حەرامـە.. وە کـڕین و فرۆشـتـی هێلکە لە خەودا خەوێکی چاکە، ئەگەر قازانجت کردبێ تیایدا، وە خواردنی هێلکەی پێگەیوو ئاسوودەیی و خۆشی‌یە.

**٦-هەڵوژە:** ئەوەی بینی هەڵوژەی گەیوو بەتام ئەخوا، یان کۆی ئەکردەوە لە درەختێك ئەوە ئاسوودەیی‌یە لە خەوەکەداو سەرکەوتنێکی گەورەیە بۆی لە مەبەست و کارەکانیدا..

وە ئەگەر نەگەیرو بوو یان سیس بوو یان تامی ناخۆش بوو یان دەیویست پێی بگات، بەڵام بێ هوورده بوو ئەمانە هەمرووی نیشانەی دڕاندنە.

**٧-هەنجیر:** هەنجیر لە خەودا ماڵی زۆرو بە پیتە بۆ کەسێ تووشی بێ بیخاتە ماڵەکەیەوە، وە شوێنەکەی ئاشکرا بێ لای، وە ئەوەی تەنها ببینێ نیشانەی ناڕەحەتی و دڕاندنە. هەنجیری گەیوو لە خەودا نیشانەی ماڵی زۆرە بۆ کەسێ یان ببێت بە خاوەنی یان بیخاتە ماڵی‌یەوە وە شوێنەکەی ئاشکرا ئەبێ.. وە هەنجیری وشك کراوە بۆ کەسێ بیخوا دڕاندن و سەرشۆڕی و خەفەتە.. وە هەنجیری وشکەوە بوو یان هەر میوەیەکی وشکەوە بوو لە خەودا شتێکی کت و پڕی خۆشە بۆ کەسێ ببینێ .. وە هەنجیری سەوز یان هەر میوەیەکی سەوزی تری نەگەیوو ناخۆشی‌یەکە کە زوو بەسەر ئەچێ.

**٨-هەینی:** ئەوەی بینی لە رۆژی هەینی‌دایە ئەوە خوای پەروەردگار ئیشە جیا جیاکانی کۆ ئەکاتەوە لە ناڕەحەتی‌یەوە ئاسانی ئەکات.

**٩-هەنجیرە توو:** هەنجیرە تور لە خەودا نیشانەیە لەسەر سامان و زۆریی قازانج بۆ کەسێ تووشی ئەبێ، وە بۆ کەسێ بیخوا یان هەندێکی بخوا ئەوە تووشی رۆزی‌یەکی چاك ئەبێ.. وە درەختی هەنجیرە توو پیاوێکی بە سوودی چاك و خۆگرو دەوڵەمەندە.

**١٠-هەواڵ:** هەواڵی خۆش لە خەودا چاوەڕوانکردنی ڕووداوێکی خۆشە، وە هەواڵی ناخۆش نیشانەیە لەسەر چاوەڕوانی ناڕەحەتی.

**١١-هێڵی ئاسنین:** هێڵی ئاسنین لە خەودا نیشانەی گەشتێکی دوورو درێژە.

**١٢-هەرزانی:** هەرزانی لە خەودا نیشانەیە لەسەر دوورکەوتنەوە بۆ کەسێ لە ناڕەحەتیدا بێت، وە بۆ لابردنی غەمەکانی بۆ کەسێ کە غەمی هەبێت.

**١٣-هاوڕێ:** بینینی هاوڕێ لە خەودا نیشانەیە لەسەر هاتنە دی ئاوات.

**١٤-هاوڕێیەتی:** ئەگەر نەخۆشێ بینی هاوڕێیەتی کەسێ ئەکات نیشانەیە لەسەر چاك بوونەوەی، وە ئەگەر بینی هاوڕێیەتی کەسانی ماڵەوەی ئەکات ئەوە نیشانەیەکی خراپە، وە ئەگەر کەسەکە نەناسراو بوو ئەوە کارێکە زیانی پێ ئەگات.

١٥-**هەنگوین**: هەنگوین لەخەودا زۆرییەکی باشە یان میراتە یان سامانە لە شەراکەتێك، ئەوەی بینی هەنگوین ئەخوا، ئەگەر نەخۆش بێ چاك ئەبێتەوە، وە ئەگەر لەش ساغ بوو ئەوە سامانێکی زۆری پێ ئەبەخشرێ.. ئەوەی بینی هەنگوینی لەبەردەمدایە نیشانەیە لەسەر شارەزایی شکۆیانە، ئەوەی بینی هەنگوین دەرخواردنی خەڵك ئەدات ئەوە قورئان ئەخوێنێ بە ئاوازێکی خۆشەوە یان خەڵکی گوێ لە گۆرانیە خۆشەکانی ئەگرن.

١٦-**هاوارکردن**: خەو بە هاوارکردنەوە نیشانەیە لەسەر بەختیاری و رزگار بوون لە نارەحەتییەك کە ئێستا جەنجاڵی کردوویت، ئەگەر کەسێکی ترت بینی هاواری ئەکرد ئەوە نیشانەیە لەسەر بەختێکی باش، بە تایبەتی ئەو کەسە هاورێت بێت، بەڵام ئەگەر دوژمنت بێت، ئەوە نیشانەیە لەسەر نارەحەتی.

١٧-**هەناسە تەنگی**: ئەگەر خەوت بە هەناسە تەنگییەوە بینی نیشانەیە لەسەر ماتی و بێزاریی لە هەندێ کاروباری ژیانتدا.

١٨-**هەراو هوریا**: هەراو هوریا لە خەودا نیشانەیە لەسەر بینینی دەوبەرەکی یان کارێکی گرنگ کە زۆربەی جۆری خەڵك تیایدا کۆ دەبێتەوە.. وە ئەڵێن چاوەروان کردنی رووداوێکی خۆشە، وە ئەگەر گوێت لە دەنگە دەنگێکی سەیرەوە بوو مانای وایە بنکەکەت گۆرانی بەسەردا دێت، ئەگەر گوێت لە دەنگە دەنگێکی بەرزەوە بوو مانای وایە کارێکی نوێ ئەگریتە دەست.

١٩-**هەنگوین**: هەنگوین لە خەودا ماڵێکە دەستگیر ئەبێ بۆ کەسێ بیخوا.. وە بەخت باشییە لە کاردا بۆ کەسێ بیبینێ یان بیکرێ، وە بۆ پیاوانی ئایینی شیرینی ئایینە، وە بۆ پیاوانی دنیا سامانێکە بە بێ ماندوو بوون.

٢٠-**هەویر**: بینین هەویر لە خەودا نیشانەی کاری ئاسان و چاوەروانی و دڵخۆشییە، سامانێکە دەستت ئەکەوێ.. ئەوەی هەویری لە ماڵەکەیدا بینی ئەوە قازانجێك ئەکات لە بازرگانییەکەیدا، ئەگەر ترشا بوو ئەوە لە بازرگانیەکەیدا ئەدۆرێ، ئەگەر خۆی بینییەوە

هەویـر ئەشـێلـێ ئـەوە سەفەرکەرێ بەرەو لای ئەم دێت، وە ئەو هەویرەی هەڵنایەت ئەوە خراپی‌یە لە ساماندا.

**٢٠-هـێلانە:** هـێلانەی چـۆلەکە لـە خـەودا مـانـای جووت بوونێکی ئاسوودەیە.. وە هـێلانەی خـاڵی لە هێلکە خێرە بۆ خەوبینەکە، وە بە پێچەوانەوەیە ئەگەر هێلکەی تێدا بێت.

**٢١-هـەڵاتن:** ئەگـەر یـەکێ بـینی لەدەستی دوژمنێ رائەکا ئەوە بێ زیان ئەبێ لەو دوژمـنـە، وە ئەگـەر زانایـەك راکـردنی بـینی ئـەوە دەبێ بە دادگەر.. ئەگەر یەکێ بینی رائەکات وە ناشترسێ ئەوە باش نی‌یە.

**٢٢-هەژاریی:** هـەژاریی لە خەودا دەوڵەمەندی‌یە، ئەوەی خۆی بینی‌یەوە هەژارە، ئەوە خۆراکـێکی زۆر بـە دەسـت ئەهێـنێ.. ئـەوەی خـۆی بـینی پارە بە هەژارێك ئەدات ئەوە سامانێکی دەست ئەکەوێ بە بێ ماندوو بوون، وە دەڵێن خەو بینینت بەوەوە کە هەژاریت، نیشـانەی ئەوەیە بەختێکی باشیت لەبەردەستایەو بە دەستی ئەهێنی، ئەگەر کەسانی [illegible]ت بینی هەژاربوون نیشانەی وایە هەواڵی خۆش ئەبیستی. وە ئەگەر بینیت یارمەتی کەس[illegible]ك ئەدەیـت کـە هەژارە یان کەسێکی تر یامەرتی تۆ ئەدات چونکە هەژاریت ئەمە باشترین جۆری خەوە چونکە بەختێکی باشت بۆ بەدەست ئەهێنێ.

**٢٣-هـەیڤ -مانگ-:** بینینی هەیڤ لە خەودا نیشانەی تەندروستی و بەختیاری‌یە، وە بینینی لە ماڵەکەتدا نیشانەی جووت بوونتە لەگەڵ ئافرەتێکی جوانی پایە بەرزدا.. وە ئەگـەر کچـێ مـانگی بـینی ئـەوە شوو ئەکات.. وە بینینی مانگ بۆ خۆشەویستان زۆر چـاکە.. وە ئەگـەر مانگـت بـینی لەنـێو هـەورەکاندا ئەدرەوشـایەوە نیشـانەی ئەوەیـە نارەحەتی‌یەکانت بەسەرئەچن.

**٢٤-هۆڵ:** هـۆڵ لە خەودا نیشانەی حەسانەوەیەو نەمانی هەژاری‌یە، نیشانەی ئافرەتی چـاکە ئەمـە ئەگـەر رووخسـاری هۆڵەکـە جـوان بێـت، ئەگـەر وا نەبێـت ماناکەی بە پێچەوانەوە دەبێت..

**٢٥-هـەرمێ:** ئەگـەر هـەرمێ لـە خەودا گەیوو بێت ئەوە خەوێکی باشە.. وە خەوت بـەوەوە کـە هـەرمێ کـۆ ئەکەیـتەوە یـان ئەیبیـنی کـە بـە درەختەوەیە مانای وایە تۆ هەواڵێکی خۆش ئەبیستی لە هاورێ‌یەکی نادیارەوە.

٢٦-**هێلەك:** هێلەك لە خەودا ڕەمزە بۆ پیاوی سوودمەند، وە نیشانەیە بۆ ئافرەتێ یان کارەکەرێ کە نهێنی هەڵناگرێ و ناپارێزێ.

٢٧-**هەنگ:** هەنگ لە خەودا نیشانەیە بۆ کەسێ شتی پاك بخواو کاری چاکە بکات، وە بینینی هەنگ لە خەودا بەڵێنە بە سەرکەوتن دوای هەوڵێکی زۆر.

٢٨-**هەڵخستنی جلی شۆراو:** هەڵخستنی جلی شۆراو لەخەودا، نیشانەی ئاشکرا کردنە لە مانی گومانی خراپ و ناحاڵی بوون و نەمانی بووهتان و درۆ.

٢٩-**هەوا:** بینینی هەوا لە خەودا تواناو هێزە، ئەگەر خەوبینەکە خاوەن ئاوات و خۆ بە زل زان بێت، ئەوە خەوەکەی بەتاڵە، ئەوەی بینی لە هەوادا ئەڕوا، ئەوە گەورەیی و سامانی حەڵاڵی دەستگیر ئەبێ، ئەگەر شیاوی ئەوە بێ، ئەگەر نا ئەوە سەفەر ئەکا.

٣٠-**هستریا:** هستریاو نموونەکانی نیشانەی غەم و خەفەتە.

٣١-**هێرشی خەڵکی:** ئەگەر کەسێ لە خەودا هێرشی بۆ هێنایت بە دەمانچە یان تفەنگ یان چەقۆ یان دار یان هەر ئامێرێ ئەوە نیشانەی هەست کردنتە بە هەڵەیەکی گەورەو ترسناکی‌یەکی گەورە.

٣٢-**هەتیو:** ئەگەر لە خەودا هەتیوو بوویت نیشانەی ئەوەیە کەسێکی تر لە کارێکی گرنگدا سەرئەکەوێ بەسەرتا، وە خۆتت بەتەنهاو بێ یارمەتی دەر ئەبینێتەوە.

٣٣-**هاوەڵیی پیاو:** هاوەڵیی پیاو لە خەودا هەوڵ دەرێکی خراپ و قەرزێکی زۆرە.

٣٤-**هەڵهاتنی شاخ:** بەرزبوونەوەی شاخ و تەپ و دەشت لە خەودا نیشانەیەکە مانای وایە لە ژیانیدا جێگایەك وە شوێنێك هەیە بۆ کێشەو کاروبارەکانی.

٣٥-**هاوڕێ:** ئەگەر خەوت بە هاوڕێیەکی دڵسۆزتەوە بینی ئەوە بەڵگەیە لەسەر هەواڵێکی خۆش.. وە ئەگەر ترسایت لە هاوڕێیەکت لە خەودا ئەوە بەڵگەیە لەسەر بیستنی هەواڵێکی نەگونجاوو بێزارکەر.

٣٦-**هەور:** هەور لە خەودا نیشانەیە بۆ سەفەر کردن لە دەریادا.

٣٧- **هەورە گرمە لەگەڵ ڕەشەبا:** پاشایەکی خراپەکاری بەهێزە.

٣٨- **هەورە گرمە لەگەڵ باراندا:** چاك بوونەوەیە بۆ نەخۆش.

٣٩- **هەورە گرمە بە بێ باران و ڕەشەبا:** هەورە گرمە بە بێ باران و ڕەشەبا مانای ترسە.

## ( و )

**١-وەزیر:** هەندێ جار بینبنی وەزیر لە خەودا نیشانەی بەرزی و دەسەڵات و بەجێهێنانی پێویستی‌یە.. وە بینینی وەزیر نیشانەی سەرکەوتنێکی بە پەلەیە. ئەوەی لە خەودا بینی بووە بە وەزیر ئەگەر شیاوی ئەوە بێ ئەوە گەورەیی و دەسەڵات و بەرزیی دەستگیر ئەبێت، ئەگەر بێجگە لەوە بێ ئەوە تووشی گوناهو لەکە ئەبێ.

**٢-وەنەوشە:** وەنەوشە لە خەودا زۆر چاکە ئەگەر گەشاوەو بۆندار بوو، چونکە ئەگەر خۆشەویست هەبێ ئەوە بەردەوام یادت ئەکات و بیری ئاراستەیە بۆت، وە ئەگەر هاوسەرت هەبێ ئەوە لایەنی دڕودم بە دڵ تۆی خۆش ئەوێ، وە هەروەها خەو بە وەنەوشەوە مانای سەرکەوتنە لە کاردا، بەڵام ئەگەر وەنەوشەکە وشك و سیس بوو، ئەوە نیشانەی دۆڕاندنە، بە هەمان شێوە ئەگەر خەوت بینی بە دوایدا ئەگەڕایت و نەتئەدۆزی‌یەوە.

**٣-وڵاخ:** سواری ئەسپ لە خەودا نیشانەی سەربڵندی و بەختیاری‌یە.. وە کەوتنە خوارەوە لەسەر پشتی ئەسپ ترسناکە بۆ سەر خەو بینەکە، ئەگەر ئەسپەکە رەش بوو نیشانەی سەرکەوتنێکی گەورەیە، وە ئەگەر سپی بوو نیشانەی سەرکەوتنێکی دیاری کراوە، ئەوەی سواری وڵاخ بوو وە لە دەستی‌یەوە کەف ئەهاتە دەرەوە نیشانەی بەخت خراپی‌یە.

**٤-وریاو هۆشمەند:** وریاو هۆشمەند لە خەودا نیشانەیە لەسەر پیاوی بەهێزی ئازا، کە ئەتوانێ زاڵ بێت بەسەر ناڕەحەتیەکاندا.

**٥-وێنەی مرۆڤ یان پەیکەر:** خەو بە وێنەی مرۆڤەوە یان پەیکەر نیشانەی بەختێکی باش و نیشێکی سەرکەوتووە.

٦ **وینەی دێوو گیانداران:** هەندێ جار وێنەی دێوو گیانداران لە خەودا، نیشانەیە لەسەر باوك و دایك.

٧-**ون کردنی ئەنگوستیلە:** ون کردنی ئەنگوستیلە یان شکانی لە خەودا نیشانەی تەلاق دانی ژنە.

٨-**وتاری ئایینی:** خەو بینین بە وتاری ئایینیی‌یەوە نیشانەی ئەخۆشی‌یە.. مەگەر وتار خوێنەکە ڕەوانبێژ بێ و بە تامەوە گوێی لێ بگریت، ئەوە پەیمانە بە ئاسوودەیی.

٩-**وتە**: ئەگەر کەسێ لە خەودا قسەی دەکرد بە چەند زمانێکی جیاواز نیشانەی ئەوەیە شتێکی گەورە بە دەست ئەهێنێ.. وە قسەی باڵندە بۆ خەو بین مژدەیە بە وەرگرتنی دەسەڵات و پلەو زانست.. وە قسەی مندالّ و مردوو لە خەودا ڕاستی‌یە، وە قسەی بێ گیانەکان ئاشتی و ئامۆژگاری‌یە.. وە قسەی درەخت پایە بەرزی‌یە.. وە قسەی گیاندار فیتنەو ئاژاوەیە.. وە قسە بە گشتی لە هەموو بارەیەکەوە ئەگەر گونجا لەگەڵ هۆش و ئاییندا ئەوە دروستەو شایانی تەفسیرە، ئەوەچاکەیە بۆ ئەو کەسەی گوێی لێ‌یە، وە پێویستە بە گوێی بکات، وە ئەگەر پێچەوانەی هۆش و ئاین بوو، ئەوە باش نی‌یەو پێویستە لێی دوورکەوێتەوە.

١٠-**وڵاخ:** خەو بە وڵاخەوە چاکە، بە تایبەتی ئەگەر ژمارەیەکی زۆر بێت، وە بە زۆری ئەگەر بەرەو ڕووی تۆ ئەهات ئەوە دەستگیر بوونی بەختێکی باشە.

١١-**وەستان لە پەنجەرەوە:** خەو بە وەستان لە پەنجەرەوە مانای سەرەتای گۆڕانکاری‌یەکی گرنگە لە ژیاندا.

١٢-**وەستان لە بەلەکۆنەوە:** خەو بە وەستان لە بەلەکۆنەداماناى وردبینی دوا ڕۆژێکی گەشاوەیە.

١٣-**وڵاخ:** سواری وڵاخ لە خەودا بەرزی و بەختیاری و ڕۆزی‌یە، ئەوەی بینی لە خەودا وڵاخی هەیە نیشانەی فراوان بوونی سامانەکەیەتی، وە سەرکەوتنی بەسەر دوژمنانیدا.. ئەوەی بینی سواری وڵاخێ ئەبێ ئەوە بەرزی و سامان و پایە بەدەست هێنانە، وە ئەگەر ئەسپ بێ لە دوژمن ئەپارێزرێ، وە ئەگەر بەچکە ئەسپ بوو ئەوە منداڵێکی جوانی ئەبێت.

# ( ی )

١-**یاری**: ئەگەر لە خەودا چەند یاری‌یەکی وەرزشیت ئەکرد، ئەوە نیشانەی بەختێکی باشە.

٢-**یاسەمین**: ئەوەی لە خەودا یاسەمینێکی دۆزی‌یەوە یان بینی، ئەوە تووشی شادی و خۆشی و خێر ئەبێ، وە نیشانەی خواستنی کچێکە.